# ئەمە لە دەرسیم ڕووی دا

## (( لە دەمی قوربانییەکانەوە ))

مونزور چەم



وەرگێڕانی لە تورکییەوە
ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل






# خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **ئەمە لە دەرسیم ڕووی دا** (لە دەمی قوربانییەکانەوە)

- **نووسینی:** مونزور چەم
- **وەرگێڕانی لە تورکییەوە:** ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل
- **پێشەکی:** د. جەبار قادر
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال ڕواندزی
- **بەرگ:** ڕێمان ئەحمەد
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانەی** موکریانی (هەولێر)
- بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەی گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٥٦٢) ساڵی ٢٠١٢ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٤٠)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**ئەم کتێبەوە بە کوردی کراوە:**

Taniklarin Diliyle
Dersim’ 38

مونزور چەم

چاپی یەکەم ئەستەنبوڵ ١٩٩٩

وێنەی بەرگی یەکەم: سەرۆکی هۆزی قۆچو: کوڕەکانی ئیدارەی ئیبراهیم ئاغا

لە چەپەوە بۆ ڕاست: جەمشید، کوڕە بچووکەکەی ئیدارە ئاغا ((لیل)) کوڕی ناوەڕاسینی.

((سەید خان)) کوڕە گەورەکەی

لە نێوان ((لیل)) و ((سەید خان))دا، ((یادۆ))ی کوڕی لیل، کە لە فۆتۆگرافەکەدا باش دیار نییە.

# ناوەڕۆك

# دەنگدانەوەی مێژوو لە دێرسیم

لە نووسینی پرۆفیسۆر جەبار قادر

ئەمە لە دەرسیم رووی دا، چیرۆکی سەدان تراژیدیایە کە لە سییەکانی سەدەی رابردوودا لە دێرسیم ( لای ئێمە دەوترێ و دەنووسرێ دەرسیم) قەومان. ئامادەکاری کتێبەکە مونزور چەم لە زاری هەندێ لە قوربانیان و نەوەی هەندێکی تریانەوە، کە لە باوك و دایك و باپیر و داپیر و کەس و کاریان بیستوویانە ، چەند لاپەڕەیەکی خوێناویی ئەو کارەساتە دەگێڕێتەوە. ئەوەی لەم کتێبەی مونزور چەمدا هاتووە لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژووییدا نابینرێ، چونکە ئەمە مێژووی ئەوانەیە کە وەکو باوە مێژوو و بەڵگە بێ ڕوح و گیانەکان پشتگوێیان دەخات.

چیرۆك و بەسەرهاتەکان پێویستیان بە شیرۆڤە و لێکدانەوە نییە و هەر هەموویان خوێنیان لێدەچۆڕێ. ئەمەی لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە دەچێتە بواری مێژووی زارەکییەوە کە بەشێکی گرنگ و زیندووی مێژووە. مێژووی زارەکی (دەنگی ڕابردووە) وەکو پاوڵ تۆمپسۆن کردوویەتی بە ناونیشانی کتێبە بە ناوبانگەکەی دەربارەی مێژووی زارەکی. بەشەکانی مێژوو لە زانکۆ پێشکەوتوو و ناودارەکانی جیهان بایەخی زۆر دەدەن بەم بابەتە و ناوەندی تایبەتیان بۆ دامەزراندووە و لێکۆڵینەوەی زۆریان لەم بوارەدا بڵاوکردووەتەوە . لای ئێمە وەکو زۆر بواری تری زانست تا ئێستا گرنگییەکی ئەوتۆی پێنەدراوە.

لە بارەی کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجە و هەندێ لە ڕووداوەکانی تری ئەم پەنجا ساڵەی دوایی کوردستانەوە هەندێ نووسین و بەرهەم بڵاوکراونەتەوە، کە دەکرێ بخرێنە

چوارچێوەی مێژووی زارەکییەوە، بەڵام وەکو تیۆری و میتۆد و پێوەرکانی کارکردن لەم بوارەی زانستی مێژوودا هێشتا لە ئاستی هەنگاوی یەکەمین لە گەشتی هەزار میلدا .

کاری کوردپەروەر و نیشتمانپەروەری گەورەی کورد دکتۆر نوری دێرسیمی راز بێ کە زیاتر لە نیو سەدە پێش ئێستا لە کتێبی (دێرسیم لە مێژووی کوردستاندا)، و دوای ئەوەش لە (خاترات) و بیرەوەرییەکانیدا بەر لە زیاتر لە سی ساڵ بەشێکی گرنگی لە تراژیدییای دێرسیم بۆ ئێمە و نەوەکانی دوارۆژ تۆمار کرد. ئەو نەك هەر لە نزیکەوە ئاگادار و شایەتحاڵی زۆر لە ڕووداو و تراژیدییاکان بوو، بەڵکو بەشدارێکی چالاکی بزووتنەوەی کوردایەتی بوو لە سەردەمی نێوان هەردوو شەڕی جیهانیدا. لە گەڵ سەرکردە و چالاکوانە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەدا هاوڕێ و هاوبیر بوو. کاربەدەستە تورکەکانی باش دەناسی و دەیزانێ چەندێ قینیان لە کوردە و یەکێ بوو لە کەسە نزیکەکانی سەرکردەی ڕاپەڕینی دێرسیم سەید ڕەزا. لە کاتی خۆیدا کوردناسانی بیانی، و ڕەنگبێ بەلای هەندێ لە نووسەرانی خۆشمانەوە، نووری دێرسیمی بەوە تۆماتبار کرابێ کە بۆ بەرگری کردن لە دۆزی کورد و بزووتنەوەی کوردایەتی و تاوانبار کردنی نەیاران، پەنای بردبێتە بەر هەندێ بۆچوونی پەڕگر و پێوەنان. بەڵام دوای پەردە لابردن لە سەر بەشێکی کەمی ڕووداوەکانی دێرسیم ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەی نووری دێرسیمی لەو بارەوە تۆماری کردووە زۆر لەوە کەمترە کە لە ڕاستیدا ڕووی داوە.

هەروەها لەم بوارەشدا وەکو زۆر بواری تری دۆزی کورد بەگشتی و لە تورکیا بە تایبەتی قەرزاری ئیسماعیل بێشکچی زانا و مرۆڤین، کە لە ڕێگەی تویژینەوە و لێکدانەوە زانستییەکانییەوە لە مەڕ (نیشتەجێکردنی بە زۆری کوردان) و (قانوونی تونجەلی ١٩٣٥ و جینۆسایدی دێرسیم) پەردەی لە سەر سیاسەت و پیلانەکانی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی کەمالی بۆ تەفروتوناکردنی دێرسیم هەڵماڵی. بێشکچی بە بەڵگەی زانستییەوە ئەوەی ئیسپات کرد کە کەمالییەکان ماوەیەکی زۆر بوو خۆیان بۆ وێرانکردنی دێرسیم ئامادە دەکرد و پلانی هەمەلانەیان دارشت بۆ ئەوەی بە یەکجار و بۆ هەمیشە ئەوەی ناویان لێنابوو (دومەڵی) دێرسیم لە کرۆکەوە دەرکەن.

لەم چەند مانگەی دواییدا کارەساتی دێرسیم بوو بە بابەتی بگرە و بەردە و ململانێی سیاسی نێوان دەسەڵات و پارتی گەلی کۆماری نەیار و هەندێ لە دیمەنەکانی ئەو تراژیدیا مرۆییە بوون بە هەواڵی گەرمی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی تورکیا.

بە هەڵدانەوەی پەردە لە سەر بەشێکی کەمی دیمەنە خوێناوییەکانی دێرسیم، هەستی خەڵکانی زۆر بزوا. تەنانەت سیاسەتمەدارێکی فێڵباز و زۆرزانی وەك ئەردۆگان، کە بەربەرەکانییەکی زۆری مافە ڕەواکانی کورد لە تورکیا و لە دەرەوەی تورکیاش دەکات و لە سیاسەتی ڕاونان و چەوساندنەوەی چالاکوانانی سیاسی و سیاسەتمەدارانی کورد بەردەوامە، و دەزانێ وتەکانی لە بارەی کوشتاری دێرسیمەوە دەبنە بەڵگەی مێژوویی و ڕەنگبێ لە سەر دەوڵەتی تورکیا زۆر بکەون، ناچارە لە بارەی ئەو کوشتارەوە بڵێ ( کارەساتی دێرسیم یەکێ لە تاڵترین و تراژیدیترین رووداوەکانی مێژووی نزیکمانە. یەکێکە لە خوێناویترین و دراماترین ئەو سەدان کارەساتە کە پارتی گەلی کۆماری لەم وڵاتەدا ئەنجامی داون)).

ڕەنگبێ لە ململانێی حزبی و سیاسیدا لە دژی پارتی گەلی کۆماری نەیار و ڕابەرەکەی کەمال قلیچدارئۆغلۆی دێرسیمیدا، ئەردۆگان بیەوێ ئیدیۆلۆژیای کەمالی، کە بەرپرسی یەکەمە لە هەموو ئەو نەهامەت و ماڵوێرانیانەدا، لە لای دانیشتوانی تورکیا بە یەگجاری قێزەون بکات بۆ ئەوەی باڵادەستیی خۆی و پارتەکەی بە تەواوی جێگیر بکات و لە شمشێری نەتەوەپەرستەکان و سوپا خۆی بپارێزێ .

ئەردۆگان ئەو قسانەی لە کۆبوونەوەیەکدا کرد لە گەڵ بەرپرسانی لقەکانی پارتەکەی پارتی داد و گەشەپێدان لە شار و دەڤەرەکانی تورکیا لە ٢٣ نۆڤەمبەری ٢٠١١ ئەنجامی دا . هەر لەوێشدا وتی ( مخابن لە ساڵانی ١٩٣٧، ١٩٣٨ و ١٩٣٩ لە دێرسیم درامایەکی گەورە ڕووی دەدا. لە ئاسمان و زەوییەوە ناوچەکە و دانیشتوانی تۆپباران دەکران، تەنانەت بۆمبی گازی ژەهراویش لە دژی خەڵك بەکارهێنرا. لە دێرسیم هەر شتێ بجووڵایەتەوە لێی دەدرا. منداڵان، ژنان گولەباران دەکران). هەر لەو کۆبوونەوەیەدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا وتە و هەستی هەندێ لە شایەتحاڵە تورکەکانی

بە بیر ئامادەبوون هێنایەوە، کە دوای ئەو هەموو ساڵەش هێشتا ناتوانن باس لەو تراژیدییایە بکەن و لە بیرەوەرییەکانیاندا داوای لێبوردن لە خوێنەرانیان دەکەن کە ناتوانن باس لەو ڕووداوانە بکەن وەکو موحسین باتور کە لەو سەردەمەدا سێ ساڵ سەرباز بووە و لە گەرمەی ڕووداوەکانی دێرسیمدا دوو مانگ لەوێ ئەرکی سەربازیی بینیوە. هەروەها ئاماژە بە مامۆستایەکی قوتابخانەی سەرەتایی دەکات بە نێوی نەجیب فازڵ کە وتوویەتی (لە مێژوودا کارەساتی وەکو دێرسیم ڕووی نەداوە) و باسی ئەو منداڵانە دەکات کە زۆر هەوڵی دا لە مەرگ ڕزگاریان بکات، بەڵام سەربازانی تورك بە سونیتاق زگیان هەڵدڕین.

لەم چەند دێڕەدا زیاتر ئاماژە بە وتە و بەڵگەکانی نووسەران و کاربەدەستانی تورك دەکەین، چونکە ئەوان لە هەموو کەس باشتر دەزانن لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا چییان بە سەر کورد هێناوە.

بە وتەی سەرۆك وەزیرانی تورکیا هەزاران کەس کە نازانرێ ژمارەیان چەندە لەو مەرگەساتە کوژران (منداڵ ، ژن و پیر بە بێ جیاوازی)، هەزاران ماڵ وێران کران، دەیان هەزار سەر مەڕ و ماڵات تاڵان کران و هەزاران مرۆڤیش بە زۆر لە زێدی باب و باپیرانیان بۆ ڕۆژئاوای تورکیا ڕاگوێزران.

ئەردۆگان بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانی ئاماژە بە هەندێ بەڵگەی فەرمی دەوڵەت دەکات. یەکێك لەو بەڵگانەش کە لە ئەرشیفی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی تورکیا پارێزراوە بریتییە لە نووسراوی سەرۆکایەتی گشتیی ژاندارم (جەندرمە) بۆ سەرۆکایەتی وەزیران کە ئاکام و ئامارەکانی کردەوە سەربازییەکانی سوپای تورك تا ئابی ١٩٣٨ لە دێرسیم دەخاتە ڕوو. لەوێدا پەیمانی ئەوەش تازەکراوەتەوە کە تا هەموو ئامانجەکان بەدەست دێن (واتا تا سەرکوت کردن و دامرکاندنەوەی تەواوی ڕاپەڕینی دێرسیم) سوپا لە هێرش و کردەوە سەربازییەکانی بەردەوام دەبێت. ژمارەی کوژراوان بە گوێرەی ئەو بەڵگە فەرمییەی دەوڵەت لە ساڵانی ١٩٣٦، ١٩٣٧، ١٩٣٨ و ١٩٣٩ بە گشتی ١٣٨٠٦ کەس بووە. لە دەرەوەی دادگا و بڕیاری فەرمی دادگا و دەزگاکانی

دەوڵەتیش هەر ئەفسەر و سەرباز و کاربەدەستێکی ڕەگەزپەرستی تورك بۆ خۆی لە ڕاوکردنی دانیشتوانی دێرسیم و ئەتککردنی ژنانی کورد و دوای ئەوەش کوشتنیان و، کوشتنی هەزاران منداڵ وبردنی کچانی کورد و بەخشینیان بە ئەفسەران و کاربەدەستانی تورکدا ....تاد سەربەست بوون و هەزاران کوردی تر بوون بە قوربانی . بۆیە ڕەنگبێ ئەو سەرچاوانەی کە باس لە ژمارەی زۆرتر دەکەن زیاتر لە ڕاستییەوە نزیك بن لە ئامارەکانی بەڵگە ڕەسمییەکانی دەوڵەت . بەپێی سەرچاوەکان نزیکەی چل هەزار کەس کوژران و دوازدە هەزار کەس بە زۆر بۆ نێوەڕاست و ڕۆژئاوای تورکیا ڕاگوێزران. گەلێك ڕێکخراوی مافی مرۆڤ کردەوەکانی حکوومەتی تورکیا لە دێرسیم بە جینۆساید و ئیتنۆساید لە قەڵەم دەدەن.

بە گوێرەی بەڵگەیەکی تری دەوڵەت کە هەر سەرۆك وەزیران بە خۆی لە هەمان کۆبوونەوەدا خستیە بەرچاو و ئەویش هەر بۆ ساڵی ١٩٣٨ دەگەڕێتەوە باس لە ژمارەی ڕاگوێزراوان دەکات کە تا ئەو کاتە ١١٦٨٣ کەس بوونە. هەر لەوێشدا ئاماژە بەوە کراوە کە هەزارانی تریش لە چاوەڕوانیدان بۆ ئەوەی ڕابگوێزرێن.

ئەردۆگان بەرپرسیارێتی کارەساتی دێرسیم دەخاتە ئەستۆی سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتە جەلال بەییار و سەرۆکی کۆمار عیسمەت ئینەنۆ. دیارە سەرۆك وەزیران ناوێرێ خۆی لە قەرەی موستەفا کەمال بدات، کە لە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەرینی دێرسیم کۆچی دوایی کرد و هەموو لایەك دەزانن داڕێژەر و جێبەجێکەری ئەو سیاسەتە بوو کە بەرانبەر بە کورد تا مردنی لە ١٠ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٣٨ پەیڕەو دەکرا. هەڵبەتە ئەم هەڵوێستەی سەرۆك وەزیران لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە بە پێی قانوونەکانی تورکیا هەر کەسێ ڕەخنە لە موستەفا کەمال بگرێ ڕوو بە ڕووی سزای قانوونی دەبێتەوە. تا سیستەمی سیاسی لە تورکیا ئەم جۆرە کۆت و بەندانەی تێدا باڵادەست بن، ناکرێ باس لە سیستەمێکی دیموکراتی جێگیر و تەندروست لەو وڵاتە بکرێت.

سەرۆك وەزیرانی تورکیا لە وەڵامی کەمال قلیچدارئۆغلۆدا کە وتبووی دەبێ دەوڵەت داوای لێبوردن لە خەڵکی دێرسیم بکات، وتی ( ئەگەر بە نێوی دەوڵەتەوە

پێویست بێت داوای لێبوردن بکرێت، و ئەگەر ئەدەبیاتی وەها هەبێ، ئەوە من داوای لێبوردن دەکەم).

لە گەڵ گرنگیی ئەم هەڵوێستەی سەرۆك وەزیرانی تورکیادا لە مەڕ کارەساتی دێرسیم، نابێ تەنیا یەك لای دراوەکە بخوێنینەوە وەك لای ئێمە باوە. بەر لە هەموو شتێك داوای لێبوردنەکەی ئەردۆگان ڕەها و بێ مەرج نەبوو، کە دەبوایە وابێ بۆ ئەوەی جێگەی باوەڕ و متمانەی کوردان بێت، بەڵکو بە چەند ئەگەرێکەوە گرێی داوە. لە لایەکی تریشەوە ئەم داوای لێبوردنە لە میانەی ململانێی سیاسی و حزبیدا لە گەڵ پارتی گەلی کۆماریدا ڕاگەیاندرا. هەروەها، وەکو نەوەیەکی سەی ڕەزا ڕۆستەم پۆلاتیش بۆی چووە ، دەبوایە ئەو داوای لێبوردنە نەك لە کۆبوونەوەیەکی حزبەکەی خۆیدا بوایە، بەڵکو لە ئەنجوومەنی وەزیران، یان لە پارلەمانی تورکیا بووبایە ، چونکە ئەوە کاری دەوڵەتە و دەوڵەتیش بەردەوامە، بەڵام ئەم پارت و ئەو پارت و ئەم سەرۆك وەزیران و ئەو سەرۆك کۆمار کاتین و ئەوڕۆ ئەردۆگانە سبەی کەسێکی تر دەبێ و بە ناوی پارتێکی سیاسی ترەوە دەسەڵات دەگرێتە دەست.

بە وتەی سەرۆك وەزیران دەبێ قلیچدارئۆغلۆ وەکو کەسێکی دێرسیمی و سەرۆکی پارتی گەلی کۆماری، کە بەرپرسی یەکەمە لە تراجیدیای دێرسیم ، داوای لێبوردن بکات، چونکە  سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ و بەرگری هەموو ئەندامی ئەو پارتە بوونە کە پارتی گەلی کۆمارییە و ئەوڕۆ قلیچدارئۆغلۆ سەرۆکایەتی دەکات.

دەبێ هۆی ئەو ڕقە ئەستورەی کەمالییەکان لە دێرسیم و دێرسیمیان چی بێ و لە کوێوە سەرچاوەی گرتبێ؟. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، کە ڕەنگبێ هەندێك لایەنی کارەساتی دێرسیم بۆ خوێنەران روونبکاتەوە، پێویستە ئاماژە بە چەند ڕاستییەکی مێژوویی بکەین.

بەر لە هەموو شتێك دێرسیم ناوچەیەکی شاخاوی سەختە و نە کاربەدەستانی عوسمانی و نە لە دوای ئەوانیش حکوومەتی کەمالی تا ساڵی ۱۹۳۸ لەو دەڤەرە دەست

ڕۆیشتوو و خاوەن نەدەسەڵات بوون. بونیادی خێڵەکی بە هێزی دانیشتوانەکەشی کۆسپێکی گەورە بوو لە بەردەم دەوڵەتدا بۆ ئەوەی باڵادەستیی خۆی بە سەریاندا بسەپێنێ. دێرسیمیان لە لایەکەوە کوردی زازان، کە دەمێك بوو وەکو هەموو کورد ببوون بە ئامانجی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی دەوڵەت و لە لایەکی تریشەوە عەلەوی بوون، کە مێژوویيەکی خوێناوییان لە گەڵ سوڵتانە عوسمانیەکاندا هەبوو. کوشتارەکانی سوڵتان سەلیم و ئەوانەی دوای ئەویش لە دژی دێرسیمیان زیندوو بوون لە بیری دانیشتوانی دێرسیم و زیاتر لە دە سەرهەڵدان و ڕاپەڕینیان لە دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانی و کەمالی تا سییەکانی سەدەی ڕابردوو بەرپا کردبوو. سیمبۆلەکانی سەربەخۆیی دێرسیمیان لەوەدا خۆیان دەنواند کە نە سەربازیان دەنارد و نە باجیان بە حکوومەت دەدا.

حکوومەتی کەمالی، وەکو دەسەڵاتێکی تۆتالیتاری کە ئامادە نەبوو هیچ قوژبن و بستێکی وڵاتی بەرینی تورکیا لە دەرەوەی دەسەڵاتی ڕەهای بێت، هەر یەك دوو ساڵ دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٢٣ کەوتە داڕشتنی پلان و پیلان بۆ لە نێوبردنی سەربەخۆیی هۆزەکانی دێرسیم. لە بری ئەوەی پەنا بباتە بەر چاکسازی و ڕیفۆرم لە بوارەکانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و پەروەردەیی و بەڕێوەبەرایەتی بۆ هەڵتەکاندنی بونیادی خێڵەکی دانیشتوانی دێرسیم و زەمینە خۆشکردن لە بەردەم دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخدا، ئەو دەسەڵاتە تۆتالیتارییە باوەڕی بە پەنا بردنە بەر توند و تیژی و وێران کردن و فەرمان دەرکردن بوو لە سەرەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی ڕەهای خۆی.

ئەو ڕاپۆرتانەی لە بارەی دێرسیمەوە ئامادە دەکران هەمیشە ئەو دەڤەرەیان وەکو برینێکی ڕەش لە جەستەی تورکیا پیشان دەدا و چارەسەرییان لە میتۆدی سەربازیدا دەبینی. لە ساڵی ١٩٢٦، واتا سێ ساڵ دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا و یەك ساڵ لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ لە ڕاپۆرتێکدا کە پشکێنەری مولکییە حەمدی بەگ ئامادەی کردبوو و لە سەدان لاپەڕە پێکهاتبوو لە لاپەڕە ١٩٩دا

نووسیبوی ( دێرسیم بۆ حکوومەتی کۆماری دومەڵێکە و بۆ ئەوەی کۆماری تورکیا بپارێزین پێویستیمان بەوە هەیە ئەم دومەڵە لە کرۆکەوە دەربێنین).  حەمدی بەگ ئەم ئەرکەی بە ( فەرزی عەین) لە قەڵەم دا بوو، واتا دەبێ وەکو ئەرکێکی ئایینی جێبەجێ بکرێت .

لە هەموو ئەو ڕاپۆرتانەی لە ماوەی دە پازدە ساڵی تەمەنی کۆماردا لە بارەی دێرسیمەوە پێش ڕاپەرینەکە ئامادە دەکران، باس لەوە دەکرا کە دەبێ بونیادی خێڵەکی بە هێز تێکبدرێ و چەك کۆبکرێتەوە و ئەوجا ((چاکسازی )) بکرێت. چاکسازیش لە تێڕوانینی کەمالیستاندا بریتی بوو لە بڕیار کە لە سەرەوە دەهات ئەوەی بچووکترین نارەزایی و ڕەخنەی لێ بگرتایە بە دواکەوتوو، کرێگرتەی بیانی، دژی پێشکەوتن تاوانبار دەکرا و دەبوایە لە نێو ببرێ .

هەروەها لەو ڕاپۆرتانەدا بایەخی تایبەت بە جیاوازی مەزەب و دیالێکت لە نێوان هۆز و خێڵەکان دەدرا بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا (دەردە کوردە) لە بەرژەوەندی دەسەڵاتدا و لە دژی یەکێتی هێزەکانی سەرهەڵداوان بەکار بێنن. لە چیرۆك و بەسەرهاتەکاندا کارەکتەرە خۆفرۆشەکان زۆر بێبەزییانە و دلڕەقانە لە تەك هاوزمان و هاونیشتمانییەکانی خۆیاندا هەڵسوکەوتیان دەکرد. لەمەدا هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئەمانە وجاش و کۆنە بەعسییەکانی لای خۆمان نابینرێ کە لە سەردەمی ڕەشی بەعسدا تاوانی زۆر گەورەیان بەرانبەر هاوڵاتیانی خۆیان کرد و دواییش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون و ئێستا لە سێبەری حزبە کوردییەکاندا لافی کوردایەتی و مەردایەتی لێدەدەن. ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی لاوازبوونی هەستی نەتەوەیی و نەمانی باوەڕ و متمانە بەوانەی دروشمی نەتەوەیی بەرز دەکەنەوە و دەور و بەریان پڕە لە کۆنە جاش و کەونە بەعسی.

لە دوای دامرکاندنەوەی بێبەزییانەی ڕاپەڕینەکانی ١٩٢٥ بە سەرۆکایەتی شیخی پیران و ئاگری داغ بە ڕابەرایەتی خۆیبون و ئیحسان نووری پاشا ١٩٣٠- ١٩٣٢، کاربەدەستانی تورکیا بڕیاریان دا تۆڵەی سەدان ساڵەی خۆیان لە دێرسیم و

دانیشتوانەکەی بکەنەوە. ڕاپەرینی دێرسیم بە زازایی ( تەرتەلەی دێرسیم ) کاردانەوەیەك بوو بۆ سیاسەتەکانی حکوومەتی موستەفا کەمال. تا ساڵی ١٩٣٥ هێشتا دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی بە سەر ئەو ناوچەیەدا نەدەڕۆیشت.

بۆ ئەوەی وەکو ڕاپەرینەکانی پێشتر کارەکە لە دەستی حکوومەت دەرنەچێ، کەمالییەکان خۆیان بۆ دێرسیم باش ئامادە کرد. یەکێك لە هەنگاوە سەرەکییەکانی حکوومەت لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەرینەکانی شێخ سەعیدو ئاگری داغ دەرکردنی قانوونی نیشتەجێکردن بوو، کە مافی دەدا بە کاربەدەستانی دەوڵەت دانیشتوانی کورد بە زۆر ڕابگوێزن و بەسەر ویلایەتەکانی تورکیادا دابەشیان بکەن بە شێوەیەك لە هیچ شوێنێك زیاتر لە ١٠٪ی دانیشتوان پێکنەهێنن.

بە پێی سیاسەتی بە تورك کردنی هەموو دانیشتوانی تورکیا قانوونی نیشتەجێکردن بە ژمارە ٢٥١٠ لە ١٩٣٤ مافی ئەوەی بە کاربەدەستانی وڵات دەدا ئەوانەی گومان لە تورکبوونیان دەکرا، بەزۆر بۆ ژینگەیەکی (پاکی ) تورکی ڕابگوێزرێن بۆ ئەوەی پرۆسەی بە تورك کردن سەرکەوتوانە بە ڕێوەبچێت. لە ساڵی ١٩٣٥دا قانوونێکی تایبەت بە دێرسیم ژمارە ٢٨٨٤ لە ژێر ناوی قانوونی بەڕێوەبردنی تونجەلی ( لە ساڵی ١٩٣٦ بە فەرمی نێوی دێرسیم بۆ تونجەلی دەگۆڕدرێت). لەو ساڵانەدا تورکیا کرا بوو بە چوار ناوچەی سەربازییەوە کە لە سەر بنەمای قانوونی نائاسایی بە ڕێوە دەبران بە ناوی بەڕێوەبەرایەتی پشکنینی گشتی (موفەتیشییەی عموومی) و چوارەمین دەزگای پشکنینی گشتیی ویلایەتەکانی دێرسیم ، ئەلازیگ ( ئەلعەزیزی جاران) و بینگیولی دەگرتەوە و ناوەندەکەی لە ئەلازیگ بوو و جەنەراڵ عەبدوڵڵا ئەلپدۆغان دەکرێ بە پشکێنەری گشتیی ئەو دەڤەرە. دەسەڵاتێکی ڕەها بە ئەلپدۆغان دەدرێت وەکو ڕاگواستنی زۆرەملێی دانیشتوان لەجێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر یان قەدەغەکردنی دانیشتنیان لە هەر شوێنێك کە بڕیاری لە سەر دەدات، بێجگە لە دادگایی کردن و لە سێدارەدان و گولەباران کردنی خەڵك. زانای تورك ئیسماعیل

بێشکچی لە بارەی ئەم دوو قانوونەشەوە دوو کتێبی تۆمار کردووە کە هەمە لایەنە لە وردەکارییەکانیانی کۆڵیوەتەوە و ناوەرۆکی دژەمرۆڤانەیانی شیرۆڤە کردووە.

لێکچوونێکی سەیر هەیە لە نێوان ئەو دەسەڵاتانەی بە پشکێنەری گشتیی ئەلپدۆغان درابوون و ئەوانەی دوای پەنجا ساڵی ڕەبەق لە ڕووداوەکانی دێرسیم لە ٢٩ ئازاری ١٩٨٧ بە عەلی کیمیاوی دران.

لە ماوەی چوار ساڵدا ئەوەی بە بیری کەسانی خوێنڕێژدا دێت لە دێرسیم پیادە کرا. بە هەزاران کەس کوژران و سەدان کەس بە سووتان سووتێنران، سەدان بگرە هەزاران ژن دەستدرێژییان کرایە سەر، سەدان و ڕەنگبێ هەزاران منداڵ بە سونیتاق زگی ناسکیان هەڵدڕا، سەدان گوند و ئاوایی سووتێنران و تاڵان کران. سەید ڕەزا کە تەمەنی لە سەرووی ٧٥ ساڵییەوە بوو و بە پێی قانوون نەدەکرا لە سێدارە بدرێ، تەمەنی کەم کرایەوە و لە سێدارە درا، بە پێچەوانەشەوە ڕەشیکی کوڕی کە ١٦ ساڵان بوو ، تەمەنی گەورە کرا و لە سێدارە درا.

سەید ڕەزا و ئەو پێنج کەسەی لە گەڵیدا لە سێدارەدران نە لە شەڕدا گیرا بوون و نە خۆیان بە دەستەوە دابوو، بەڵکو بۆ گفت و گۆ لە گەڵ بەرپرسانی دەوڵەتدا بانگ کرابوون. کوڕەکەی هاتبوو هەواڵی باوکی بپرسێ بزانێ بۆ دوا کەوت و نەگەڕایەوە، ئەویش گیرا و تەمەنی گەورە کرا لە سێدارە درا.

ئەوەی تا ئێستا لە بارەی کارەساتی دێرسیمەوە پەردەی لە سەر هەڵدراوەتەوە چمکێکی کەمی ئەو تاوانانەیە کە لەو دەڤەرەدا پیادە کراون. پێم وایە هەموو گەلی تورك بە هۆی ئەو کردەوە خوێناویانەوە لە چاوەڕوانی ڕۆژانێکی پڕ لە ئازاری ویژداندایە. ڕەنگبێ تەنیا ڕێگە بۆ دەرباز بوون لەو بارە داننانە بە دڕندەیی ئەو تاوانانەدا و داوای لێبوردنێکی بێ مەرج و نیازپاکییە و ڕێگە گرتنە لە سیاسەتی ئینکار و دوژمنکارانە بەرانبەر کورد لە تورکیا و لە دەرەوەی تورکیا و هەوڵی پێکەوە ژیانێکی سەرفرازانە و شەرەفمەندانەیە .

## پێشەکی وەرگێڕ

ساڵی ١٩٣٨ز، لە باکووری کوردستان، لە دەرسیم و دەوروبەرەکەیدا ڕاپەڕینێك بەرپا بوو، دەوڵەتی تورکیش بەوپەڕی توندو تیژی و بێ بەزەییانە راپەڕینەکە کپ دەکاتەوە و خەڵکێکی زۆری بێ تاوان بوونە قوربانی.. دانیشتووانی دەیان گوندی بە کۆمەڵ کوشت کە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کارەساتی وا ڕووی نەداوە، تەنیا بە قەتلوعامی ئەو سیڤلانە دڵیان ئاوی نەخواردووەتەوە، کانییان وشك کردووە و ئەشکەوتیان تێکداوە و دارستانیان سووتاندووە تا درێغیان لە کوشتنی ئاژەڵیشدا نەکردووە..

لە ٢٠٠٨/١١/١٣ پەرلەمانی ئەوروپی، لە شاری برۆکسل، کۆنفرانسێکی سەبارەت بەو کۆمەڵ کوژییەی دەرسیم ئەنجام دا، لە کۆتایی کۆنفراسەکەشدا چەندین پێشنیار و بڕیاری گرنکیان دەرکرد..

من تا ئێستا نەمبیستووە، کورد -هەر بۆ وەربیرهێنانەوەش بێ- یادی ئەو کارەساتەی کردبێتەوە و بەبیری ئەم نەوەیەی ئێستای هێنابێتەوە.. ڕاستە کورد زەینی کوێرە؟.

بۆ ئەوەی ئەم بەشەی کوردستانیش لەو کارەساتە ئاگاداربێ و بزانێ چی بەسەر نەتەوەکەیدا هاتووە.. ئەم کتێبەی {مونزور چەم}م کردووەتە کوردی، کە ژمارەیەکی زۆری لە شایەتحاڵەکانی ئەو کارەساتەی دواندووە، دواجار لە کتێبێکدا بەناوونیشانی ((لە دەمی شایەتحاڵەکانەوە درسیم ٣٨)) ساڵی ١٩٩٩ چاپی کردووە.. شایەتحاڵەکانی ئەو کەسانەن خۆیان کارەساتەکەی ١٩٣٨یان بینیوە، یان لە دەمی ئەوانەوەیە کە لە کەسوکارەکانیانەوە گوێیان لێ بووە، یان ئەو کاتە منداڵ بوونە و هەندێك لە ڕووداوەکانیان لە بیرماوە، ((چەم،یش ئەو گێڕانەوانەی بە کاسێت تۆمار کردووە، دوایی ڕێکی خستوون و هەر بە زمانە سادەکەی شایەتحاڵەکان چاپی کردووە..

هەروەکو خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا دەڵێ ((ئەم کتێبە پازدە چاوپێکەوتنە سێ لەو دیمەنانە من ئەنجامم نەداون.. کاسێتەکانیان بەمن داوە منیش چۆنیان گێڕاوەتەوە دەستکاریم نەکردوون، هەوڵم داوە وەکو خۆیانیان بنووسمەوە، تەنیا لە هەندێك شوێندا لە

ڕووی زمانەوە دەستکاریم کردوون، یان دووبارە کردنەوەکانم لێ لاداون، کە بە تورکیشم کردووە، وشە بە وشە وەرمنەگێڕاون هەوڵم داوە دەقەکە لە هەردوو زمانەکەدا لێك نزیك بکەمەوە)).

هەروەها دەڵێت (دەردەکەوێت ڕووداوەکان تەنیا لەنێوان داگیرکەر و داگیراکراودا نەبوون، ناکۆکی نێوان دەرسیمییەکانیش دەردەخات، لەلایەك خەبات و فیداکارییەکانیان دەردەخات، لە لایەکیشەوە پەردە لە ڕووی خیانەت و خیانەتکارانیش لادەدا کە بەرانبەر هاوزمانەکانی خۆیان کردوویانە..) مونزور چەم، چاکی کردووە، ناوی ئەو خائینانەی ئاشکرا کردووە کە پێش لەشەکری تورك دەکەوتن و ئەو ئەشکەوت و دارستانانەیان بۆ لەشکر دەستنیشان دەکرد کە کوردەکان خۆیان تێیدا دەشاردەوە.. ڕاستە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە خائینان نەکەوتنە پێش سوپای بەعس لە ئەنفالەکەدا... بەلای منەوە، مێژوو دەبێ ئاوا بنووسرێ، ئەوانەی خیانەت لە نەتەوەی خۆیان دەکەن ناویان ئاشکرا بکرێ، تا نەوەکانی داهاتوویان لێ بە ئاگا بهێنێتەوە. لەلایەکی ترەوە، زیان و ماڵ وێرانیەکە تەنیا بۆ دەستەیەك و هۆزێ نەبوو، یان تەنیا بۆ ئەوانە نەبوو بەشداری ڕاپەڕینەکەیان کرد.. قەتلوعامەکە وەکو یەك هەمووی گرتەوە، ئەوانەی لە ماڵی خۆشیاندا دانیشتبوون و ئەوانەش کە یارمەتی دەوڵەتیان دەدا، هەموویان وەکو یەك قڕکران.. یەکێکی وەکو (رایور قۆپ) ساڵانێکی دوور و درێژ لە خزمەتی عوسمانییەکان و کۆمارییەکانیشدا بوو، کەچی ئەویشیان کوشت..

گرنگ نییە بە تەنیا مێژووی خۆمان بزانین، گرنگ لەوەدایە، پەند و عیبرەت لە مێژوو وەرگرین.. ئەو دووبەرەکی و ناتەباییەی لەناو کورددا هەبووە تەماشاکە تووشی چ کارەسات و ماڵ وێرانییەکی دەکات. چۆن لەم درمە چارە دەکرێ، بە مێژووی خۆماندا بچینەوە، هۆکارەکانی دەستنیشان بکرێ، چارەسەری بۆ دابنرێ، ئەگینا مێژوو چ سوودێکی دەبێ پەند و عیبرەتی لێوەرنەگیرێ.

ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل

٢٠١٢/١ هەولێر

# پێشەکی چاپی یەکەم

ئەمساڵ (ساڵی لە چاپدانی کتێبەکە ١٩٩٩ز)، ٧٥ ساڵ بەسەر دامەزراندنی کۆماری تورکیادا تێدەپەڕێ و (٦٠)تەمین ساڵوەگەڕی قەتلوعامەکەی دەرسیمە. بێ گومان ئەم دوو ڕووداوە پێوەندییان بە یەکەوە هەیە و بە یەکەوە بەستراون.. ئەم کتێبە، لەگەڵ ئەوانەی ئاگاداری ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٣٨ز)ی دەرسیمن، زنجیرە دیمانەیەکی لە خۆ گرتووە.. لەم بارەوە دەمەوێ چەند وشەیەك بێژم..

.. کاتێ خەریکی نووسینی ڕۆمانی (پێبکەنە دەرسیم Gulumse Ey Dersim)[1] بووم، چاوم بە گەلێ کەس کەوت و دواندمن، لەبارەی کارەساتەکەوە گەلێ زانیاریم وەدەستهێنا و لە نووسینی ڕۆمانەکەدا سوودم لێ بینین، ئەو دواندن و دیمانانە بوونە بناغەی ڕۆمانەکە..

کارکردنی بەردەوامم لەسەر ئەو بابەتە و دیتنی کەسانی ئاگادار لەو مەسەلەیە، چەند ڕیپۆرتاژ و دیمانەیەکی لێ کەوتەوە، هەندێکیانم لە بلاوکەرەوە جیاجیاکاندا بلاوکردەوە، هەستم کرد مانەوەی ئەو زانیاری و بەڵگانە بە پرش و بلاوی لە تۆیی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا، ئامانج و مەبەستی خۆیان ناپێکن، بۆیە بە باشم زانی، لە کتێبێکدا بلاویان بکەمەوە، بەمجۆرە ئەم کتێبەی بەردەستتانی لێ هاتە کایەوە..

کێشەی دەرسیم چی بوو؟ لە دەرسیم چی ڕووی دا و چی ڕووی دەدا کەوا دەوڵەت لەوێدا پیر و منداڵ، ژن و پیاو بەبێ جیاوازی بە هەزاران ڕەشەکوژی بکات، چیاو بەردی بسووتێنی، ئەشکەوتەکانی خاپوور بکات، ئاگر لە ڕەزو پەڵەگەنم بەردا و دێکان چۆڵ بکات.. هەڵبەت شتێك هەیە.. بۆ زانینی ڕاستییەکان و بزانین لە دەرسیم

---

١- سیبیانەی —پێبکەنە دەرسیم- ڕۆمانێکە لە نووسینی مونزور چەم، بە شێوەیەکی هونەری ڕووداوەکانی ئەو کارەساتەمان بۆ دەخاتەڕوو، ساڵی ١٩٩٠ز لە کولن چاپکراوە. ساڵی ١٩٩٦ز دووبارە لە ئەستەنبوڵ چاپ کراوەتەوە، ٢٠٠٦ چاپی سێیەمی لە دیاربەکر دەرچووە.

چی رووی دا ئەوەی لە دەرسیم ڕووی دا بەشێکە لە سیاسەتی زەبروزەنگی نەتەوە پەرستە دەمارگرژەکانی تورك بەرانبەر بە گەلی کورد و ئەو میللەتانەی دیکەی لەوێدا دەژیان. ئەو سیاسەتەی بەرانبەر ئەرمەن و ڕووم پەیڕەوکرا، هەمان ئەو سیاسەتەیە لە دەرسیم ئەنجامیان دا..

پەیڕەوکردنی ئەو جۆرە سیاسەتە، بۆ هۆی ئابووری و سیاسی دەگەڕێتەوە، تا دەست بەسەر سامان و واری خەڵکیدا بگرن، هەمان ئەم سیاسەتەی لە سەردەمی جمهوریەتدا لەسەری دەڕۆیشتن، لەسەردەمی عوسمانییەکانیشدا پەیڕەو دەکرا.

کە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی نەخۆش کەوت و بەرەو ڕووخان ڕۆیشت ئەو میللەتانەی لەژێر دەسەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا بوون، یەك لە دوای یەك خۆیان ڕزگار کرد و دەوڵەتی سەربەخۆیان دامەزراند. ئەمە کارێکی ئاسان و سووك نەبوو بۆ دەمارگرژانی تورك، بەلای ئەوانەوە ناکرێ سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بگۆڕێت، ئەو میللەتانەی لەژێر دەستیاندا بوون، بەوان بوایە هەروا بۆ کۆیلایەتی بمێننەوە، ئەم تێفکرین و بۆچوونی ڕەگەز پەرستانەی تورکە، لە دیموکراتییەتەوە دوورە و پێچەوانەی خواست و ویستی میللەتانە، ئەوان دانیان بە بوونی نەتەوە جیاکاندا نەدەنا، لەو بڕوایەدا بوون هەر بوونیانیش نییە.. ((تاڵیب پاشا)) یەکێك بوو لە کەسایەتییە دیارەکانی {ئیتحاد و تەرەقی} کە باڵیۆزی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە قەتلوعامی ئەرمەنییەکان چاوی پێکەوتووە. بەتایبەتی ئەو هێرشەیان بۆ سەر ڕوومەکان و ڕاگواستنیان هەر لە دوای قڕکردنی ئەرمەن، ئەلعەت پاشا وتبووی: لە ئەنجامی کاری دوژمنانەی ئەو گەلانە بەرانبەر بە تورکیا، ((ئەیالەت)) لە دوای ئەیالەتی لە دەستچوو، یونانستان، سربیا، ڕۆمانیا، بولگارستان، بۆسنە و هیرسك، میسر، تەرابلوس، هەمووی لە دەستمان دەرچوون، جا بۆ ئەوەی پارێزگاری ئەو خاکانە بکەین کە بەدەستمانەوە ماون، دەبێ لەو تاخم و کۆمەڵانە رزگارمان ببێ و لە ناویان بەرین. تورکیا هی تورکەکانە...

سیاسەتی شۆڤینیانەی تورك لەسەر یەك شێوە و تەرز پەیڕەو نەدەكرا، گەلێ شێوە و ڕێگایان بۆ ئەنجامدانی ئەو سیاسەتە بەكاربردووە، ئەمەش هۆی خۆی هەبوو.. بۆ نموونە، ئەو سیاسەتەی بەرانبەر ڕوومەكانیان پیادەكرد، هەمان سیاسەتیان لە ئاست ئەرمەن بەكارنەبرد، ئەرمەنییەكانیان قەتلوعام كرد. هەروەك نازییەكان لە دژی جووەكان ئەنجامیان دا، ڕۆمەكانیان (قەتلوعام) نەكرد، ڕاگواستنیان بە باش زانی... دوای دامەزراندنی جمهوریەتی توركیا، ئەم سیاسەتە شۆڤینییە سەختتر و بە بەرنامەتر بوو، ژینی كۆمەڵگا لەژێر دەسەلآت و ئیرادەی یەك ئایدیۆلۆژیدا بەڕێوەدەچوو..

مستەفا كەمال، میللەتی توركی لە سەرووی هەموو ڕەگەز و ڕەچەڵەك و نەتەوەیەك دادەنا، دەیگوت، خوێنێكی پاك و خاوێن لە دەماری توركاندایە..

لە دوای دە ساڵ، هیتلەر هەمان سیاسەت و بۆچوونی هەبوو ئەوەی مستەفا كەمال گوتوبووی، هیتلەر لەبارەی ئەڵمانەكانەوە هەمان شتی دەگوت..

ڕەگەزپەرستانی تورك لەو باوەڕەدان، هەموو شارستانییەتە كۆنەكان: بابل، میزۆپۆتامیا، میسر، ئەنادۆل، چین، هند، ئینكا، لە بنەڕەتدا بۆ شارستانیەتی تورك دەگەڕێنەوە!!. بە كورتی، لەو بڕوایەدان، تورك باوكی هەموو شارستانییەكانە، زمانی توركیش لە هەموو زمانەكان شیرین و جوانترە و دەوڵەمەندترە، زمانی توركی ((خۆر))ە و زمانانی دیكەش تیشكی ئەو خۆرەن.. مستەفا كەمال گەلێك جار ئاوای گوتووە:

((چەند سەربەرزییە بۆ یەكێ كە دەڵێ توركم))

((توركێك هامتەقاو بەرانبەر هەموو دنیایە))

((كار بكەو، شانازی بەوەوە بكە كەوا توركی)).

((ئەی گەنجی تورك ئەو هێزەی تۆ دەتەوێ لە خوێنەكەتدایە))

ئەم وتانە بوونە دروشمی ڕەگەزپەرستانی تورك، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا سیاسەتمەدارانی تورك مارشی ((دەیەمین ساڵیان)) هەڵبژارد..

بڕوانە:

((بەم تواناو هێزەوە خراپە و دواکەوتن دەخنکێنین خۆرین و بەسەر تاریکیدا هەڵدێین.

تورکین و لە هەموو کەسیٚ سەربەرزترین.

ئێمە لە پێش مێژووەوە هەین، دوای مێژووش هەر دەبین. تورکین و قەڵغانی پۆلاینی کۆمارین

وەستان بۆ تورك نەهاتووە، تورك لە پێشەوەیە.))

لە ساڵی ١٩٣٠ز ((کۆمەڵەی لێکۆڵینەوەی مێژووی تورك)) دامەزرێنرا ڕاستەوخۆ مستەفا کەمال سەرپەرشتی ئەم دامەزراوەیەی دەکرد، ئەوەی ئێمە ئاگامان لیٚ بیٚ، ساڵی ١٩٣٠ز سیٚ کتێب و ساڵی **١٩٣٢**ز چوار کتێب ئامادەکران، تا لە قوتابخانەکاندا بخوێنرێن، بابەت و ناوەڕۆکی ئەم کتێبانە هزری نازییەتی تێپەڕاند بوو، ئەمە مشتێکە لە خەروارێك:

((مێژووی تورك ئەوە دەردەخات، لە پەیدابوون و لەدایك بوونی مرۆڤایەتییەوە کۆنترین ڕەگەزن لە جیهاندا شارستانییەتە یەك لە دوای یەکەکان، کە مرۆڤایەتی لە تاریکی دەرهێنا لەسەر دەستی ئەوان دامەزرێنراوە... لە هەموو بوارەکانیشدا داهێنەرن و لە سەرووی هەموو ڕەگەزەکانی دیکەی دنیادان..)).

ئەم تێڕوانینە چەوت و سەقەتە، ئەم بۆچوونە دوور لە ڕاستییەوە، بووە هۆی ڕێز لێنەگرتن لە زمان و کولتوور و پێناسە و بوونی گەلانی دیکە کە لە گەڵیاندا دەژین..

بۆیە بەم سیاسەتە شۆڤینیەوە، کە ڕژێمی تورکیا پەیڕەوی دەکات، بیٚ گومان دان بە بوونی گەلی کورددا نانێت و ناوی کورد تا ماوەیەکی درێژیش بە تاوان دادەنرا و زمانەکەشی بە زمان دانەدەنا.. گەلێك وتە و دەستەواژەی سەیرو سەمەرەو ناماقووڵیان بۆ کەمکردنەوە و بچووککردنەوەی کورد و زمانەکەی بەکاربردووە..

بڕوانە، مستەفا کەمال لە وتەیەکیدا چ دەڵێت: ((ئێمە بەڕاستی میللەتی خۆمان خۆش دەوێت، کەسانێکی نەتەوەیین، جمهوریەتەکەمان لە کۆمەڵگەی تورکی

پێکهاتووه، هەر یەکێك لەناو ئەم کۆمەڵگایە چەند بە کولتووری تورك چەکدار بێ ئەوەندە جمهوریەتەکەمان بە توانا و بەهێز دەبێ)).. ((ئینۆنۆ)) گوتوویەتی: ((کاری ئێمە لەناو ئەم نیشتمانەدا ئەوەیە، ئەوەی لێرە دەژی دەبێ بە تورکی بکەین)).

دوای تێپەڕینەکەی ١٩٢٥ز، لەلایەن ((حەروك رەرزە))وە ڕاپۆرتێك ئامادە کراوە، لە بەشێکی ئەو ڕاپۆرتەدا هاتووە: (دوو میللەت کە لە یەك "ڕەگەزن" مومکین نییە دەسەلاّتیان لە تورکیادا هەبێ، بۆیە پێویستە دەسەلاّت تەنیا بە دەستی تورکەوە بێت و بەس، دەبێ ئەمە فەرز بکرێت و بە پێویست بزانرێ).

هەروەها وەزیری دادی ئەو کاتەش لە وتەیەکیدا گوتوویەتی: (کەسی بالاّ دەست و خاوەنی ئەم ولاّتە تەنیا تورکە، ئەوەی لە ڕەگەزی تورك نییە، تەنیا یەك مافی هەیە ئەویش ئەوەیە ببێتە کۆیلە و خزمەتی کەسانی دیکە بکات).

لە ساڵی ١٩٢٥ز، پلانی چاکسازی ڕۆژهەلاّت دانرا، ئەمە تایبەتی بۆ تواندنەوە و لەناوبردنی کورد دانرا، ئەمە بە بەڵگەیەکی ڕەگەزپەرستی دادەنرێت.. لەو دەمەدا ((یاسای نیشتەجێ بوونی زۆرەملێ)) هاتە ئاراوە، کە ژمارەی ئەو یاسایە (٢٥١٠)یە، هەندێك لەو یاسایە دەڵێت: ((ئەوانەی بە زمانی تورکی نادوێن، بە کۆمەڵ نیشتەجێیان بکەن، نابێ زەوی و زار بە ناویانەوە بکرێت، مافی ئەوەشیان نییە ببنە خاوەن کارگە)).

بە پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی ئاوا کەوتنە قڕکردنی کورد.. بەڕاستی ئەمەش ڕووی دا و بە کردەوە لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی قۆچگیری و دەرسیم و پیران و زیلان و ئاگری، ئەو سیاسەتەیان پەیڕەو کرد.. بڕوانە ساڵی ١٩٣٠ز، یەکێك لە ڕۆژنامەکان چی نووسیوە:

((دۆڵی زیلان پڕاو پڕ لە لاشەیە، ئەو دێهاتانەی بەشداری یاخیبوونەکەیان کردبوو لەناوبران، تا ئێستا ژمارەی کوژراوان گەیشتووە ١٥ هەزار کەس، لەم هەفتەیەدا دەست بە هێرشی ((ئاگری داغ))یش دەکرێت...

لە دەرسیم، توندتر و دڵڕەقانەتر هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کورددا کرد. ئەمەش هۆی تایبەتی خۆی هەبوو. دەوڵەتی عوسمانی لە هیچ سەردەمێکیدا بۆی نەکرا دەرسیم بخاتە ژێر تەواوی دەسەڵاتی خۆیەوە. ئەو دەڤەرە جۆرە ئازادی و سەربەخۆییەکیان بۆخۆیان دەستەبەر کردبوو، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەرسیمییەکان تارادەیەك لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت دەرچووبوون. سەردەمانێکیش هەر بە تەواوی لەژێر دەسەڵاتدا نەمانەوە، داواکانی خەڵکەکەش تادەهات زۆرتر دەبوو، بە ئاشکرا داواکانیان دەخستە ڕوو، دەبێت ئەوەش بوترێت، دەوروبەری دەرسیم ((عەلەوی))ییەکانی تێیدا نیشتەجێن.. تا لە سەردەمی مستەفا کەمالیشدا، دەرسیمییەکان هەر خۆیان لە ڕژێمەکەی بە دوور دەگرت. بەرانبەر سیاسەتی مستەفا کەمال، یەکەم ڕاپەڕینی کورد ساڵی ١٩٢١ز قۆچگیری بەرپا بوو، لەبەر هەموو ئەمانە، مستەفا کەمال، ڕقێکی لە ڕادەبەدەری بەرانبەر دەرسیم و دەرسیمییەکان هەبوو.

ساڵی ١٩٣٠ز، ڕاپەڕینەکەی ئاگری داغ بەرپا بوو. ماریشال ((فەوزی چەقماق))، لە ئەرزنجانەوە، بۆ ((ئینۆنۆ))ی وەزیری ناوخۆی ئەوددەمە سەبارەت بە بارودۆخی کورد بەگشتی و دەوروبەری دەرسیم دەنووسێت، ئەمە هەندێك لەو نامەیەیە:

{... ٢- لە مەرکەزی ئەرزنجان دە هەزار کورد هەیە، ئەمانە ((عەلەوی))ن، هەوڵی ئەوە دەدەن دێهاتە تورکییەکان بە دێی کوردی بکەن و زمانی کوردییان تێیدا بڵاوبکەنەوە... هەندێك لە ((عەلەوییە تورکەکان)) خەریکن زمانی دایکیان واز لێ دێنن و بە کوردی دەدوێن، دەبێ ئەمە چارە بکرێت، تاکو زمانی تورکی لە هەموو لایەك بڵاودەبێتەوە.

٣- لە ناوچەکەدا، هەندێك فەرمانبەر و مەئمووری کورد هەن، بۆ نموونە، لە ئەرزنجان ((شەوقی ئەفەندی)) پارێزگاری لە کوردەکان دەکات و شەوانە کوردەکان لە ماڵی ئەودا کۆدەبنەوە.. هەرچۆنێك دەبێ، گەرێ بگوێزرێتەوە}.

هەروەها ((فەوزی چەقماق)) لەبارەی دەرسیمەوە ڕاپۆرتێکی دیکەی ئامادە کردووە دەڵێت: ((دانیشتووانی دەرسیم "جاهیلن")).. لە دوایشدا کۆمەڵێك پێشنیار دەکات، لەوانە:

((لەناوچەکەدا، دەبێ زمانی تورکی جێگای زمانی کوردی بگرێتەوە.

دەبێ هەموو کارمەندەکانی ئەوێ بگوێزرێنەوە. دەرسیمییەکان بە قسەی نەرم نایەنە سەر ڕێ، دەبێ چەکیان لە دژ بەکاربهێنین))- گەلێك ڕێنمایی و پێشنیاری دیکەی کردووە و هەمووی بۆنی دەمارگرژی و نەتەوە پەرستی لێ دێت-

بە ئاشکرا مستەفا کەمال، لە لێدوانێکیدا لەبارەی دەرسیمەوە نیاز و نیەتی خۆی دەردەخات {ئەگەر لاپەڕەیەکی گرنگ هەبێ لە کاروبارەکانماندا مەسەلەی دەرسیمە، دەبێ ئەم برینە، ئەم دومەڵە مەترسیدارە هەڵکەنین و لە ناوانا نەمێنێ، پاکی بکەینەوە و لە ڕیشەوە هەڵیکەنین بە هەر نرخ و بە هایەك بێ لە کرۆك دەریبهێنین، لەم بارەوە دەبێ بڕیاری بە پەلە بدەین و دەسەڵاتی بەربڵاو بە حکوومەت بدرێ...))

لە ٤ی مایسی ١٩٣٧ز دا، حکوومەتی تورکیا لە کۆبوونەوەیەکدا مستەفا کەمال تێیدا بەشدار بووە، لەو کۆبوونەوەیەدا ((فەوزی چەقماق)) سەرۆکی ئەرکانی سوپا ئامادە دەبێ. بڕیاری ناردنی سوپا بۆ دەرسیم دەدەن. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا هەندێك بڕیاری مەترسیدار دەردەکەن: {ڕووخاندنی هەموو دێهاتەکان و ئەوەشیان لێ دەمێنێتەوە دوور بخرێنەوە.}

هەر ئەو ڕۆژە، بە زمانی کوردی ((کرمانجی ژووروو)) و بە زمانی تورکی بەیاننامەیەك بە فڕۆکە بەسەر (دەرسیم)دا بڵاودەکەنەوە. هەندێك لە ناوەرۆکی ئەو بەیاننامەیە کە بەسەر ناوچەکەدا بڵاوی دەکەنەوە: {ئێوە لە هەموو لایەکەوە ئابڵووقە دراون، ئەگەر بڕیارەکانمان لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا جێبەجێ نەکەن هێزی کۆماری تورکیا هەمووتان قڕ دەکات بە باشی بیخوێننەوە، کە پڕە لە میهر و بەزەیی (!) لەگەڵ خێزانەکانتاندا بیری لێ بکەنەوە و بە زووترین کات وەڵام بدەنەوە، ئەگینا

هێزەکانمان ئامادەی هێرشکردنن و لە ناوتان دەبەن بەشێوەیەکی وا ئێوە چاوەڕێی ناکەن، دەبێ بۆ دەوڵەت ملکەچ بن)).

((قەتلوعامەکەی)) دەرسیم، دوای تەواوبوونی ڕاپەڕینەکە دەستی پێکرد.. لە ٢١ی تەمموزی ١٩٣٨ز، دۆڵی ((لاچ)) Laf کەوتە دەستی سوپای تورك و ڕاپەڕینە چەکدارەکە کۆتایی پێهات. کەچی ئەوجا سوپای تورك ڕژانە ئەو دەڤەرەوە. با لێرەو لەوێش دەرسیمییەکان بەرەنگارییان نیشان دابێ، بەڵام بە گرتنی ((لاچ)) ڕاپەڕینەکە کۆتایی هات، دەوڵەت سوپاکەی نەکێشایەوە، بەڵکو سوپای دیکەی هێنا بۆ ئەنجامدانی مەبەستەکەی، کە قڕکردنی دانیشتووانی دەڤەرەکە بوو..

لە بەیاننامەیەکدا ئەرکانی سوپا دەریکردووە دەڵێت: ئەو ((موناوەرە))یە لە قۆناغی یەکەمدا هەموو ناوچەکانی دەرسیم دەگرێتەوە.. بەمجۆرەش ئەنجام دەدرێت: لە هەموو لایەکی ناوچەکە دەستی پێدەکرێت، دەبێت بە کەمترین کات و بە توندی و کاریگەرانە یاخیبووان لە هەر کوێیەکدا هەبن و خۆیان شاردبێتەوە لەناویانبەرن و نەهێڵن دزە بکەنە شوێن و ناوچەکانی دیکە...

((جەلال بایەری)) سەرەك وەزیرانی ئەودەمەی تورکیا دەڵێت:

((مستەفا کەمال، تەماشای کردم وتی: .. دەزانم لەوێدا ئەمن و ئاسایش بەرقەرار دەبێ.. هەرچی دەبێت بابێت، مەسئولیەتەکە دەخەمە سەر شانی خۆم.. لێیاندەن.. وای گوت..، ئێمەش لێماندان..

ئەرکانی سوپا، ئەنجامی ((مناوەرە))کە ئاشکرا دەکات.. دوای ١٠ ئابی ١٩٣٨ز لە یەکەم قۆناغی موناوەرەکەی سوپادا، ئەو ناوچەیەی پاککردەوە و هەزاران کەس لەوێ دەستگیرکران، بڕ بڕ بۆ ناوچە دوورەکانمان گواستنەوە بە هەزارانیش لەناوبران...

لێرەدا کە دەڵێت هەزاران کەسمان لەناوبرد، بێ گومان ڕاستییەکەی نەوتووە... ئەوانەی کوژران و لەناوچوون دەیان هەزاری تێپەڕاند..

لە ٣٠ی ئابی ١٩٣٨زدا، مستەفا کەمال تەلەگرافێکی ((فەوزی چەقماق)) دەگاتە دەستی ئاوا وەڵامی دەداتەوە: ((سوپای بەتوانا و باڵادەستمان وەکو هەمیشە

جێگای بڕوای میللەتە، ((موناوەرە)) پڕ شانازییەکەی سوپا کارێکی گەورەی ئەنجامداوە. تەلەگرافی سەرکەوتنەکەتانم پێگەیشت، پڕ بە دڵ سوپاسگوزاری سوپا دەکەم..

هەرچەندە لە نامە و تەلەگرافەکانیاندا، وای دەردەخەن کەوا ((موناوەرە))کەیان کۆتایی پێهاتووە.. بەڵام لەڕاستیدا بزووتنەوەکە تا کانوونی یەکەم بەردەوام بووە، ئەوەتا لە تەلەگرافێکی دیکەدا دەڵێن: ((قۆناغی یەکەم و دووەمی موناوەرەکە کۆتایی هات، لە یەکی ئەیلوولی ١٩٣٨ قۆناغی سێیەم دەستپێدەکەین...

خاکی ئەنادۆڵ و مۆسۆپۆتامیا، گەلێ شارستانیەتی بینیوە، لەلایەکی دیکەوە بەربەریەت و خراپیشی بینیوە.. ئەم خاکە بابلییەکان، ئەسکەندەری گەورە، ڕۆمانییەکان، عەرەبەکان، مەغۆل، تەتەر، عوسمانییەکانیشی ناسی، چەندین جار داگیرکراوە، وێران و تالآن کراوە، قەتلوعام و ڕاگواستنی بینیووە، بەڵام لەم سەد ساڵەی دواییەدا، شۆڤینیزم ئەم شوێنەی ویران کردووە کە لانکەی شارستانیەتە. بە ملیۆنەها مرۆڤی قەتلوعام کردووە، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ژمارەی دانیشتووانی ئەنادۆڵ چواریەکی کرستیان بوون، کە شەڕ کۆتایی هات، لە نیوە زیاتریان بۆ ڕۆژئاوای تورکیا گوێزرانەوە. کوردیش کەمی بەسەر نەهاتووە.. میللەتەکەمان لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ لە بەرامبەر ئەم ڕەگەزپەرستی و خوێن مژینە بەرگری لە بوونی خۆی دەکات.. ئەوەی لەسەر ئەم خاکە ڕوودەدا، یەکێکە لە نموونە هەرە ناشیرین و قێزەونەکانی ناو مێژوو. دانیشتووانی ئەنادۆڵ و مۆسۆپۆتامیا، ئەو وحشییەت و ناحەقیەی بەرانبەر بە زمان و کولتوور و بوونی دەکرێ، ئەو ڕەشەکوژییەی دەرحەقی کراوە لە مێژوودا نموونەی نییە و ڕووی نەداوە...

جینۆسایدەکەی دەرسیم بەشێکە لەو بەسەرهات و ڕووداوانەی بەسەر ئەم میللەتەدا هاتووە...

باڵیۆزی نەمسا لە تورکیا، بەناوی ((ڤینتەر)) لە ٢٤ی مایسی ١٩٣٧زدا، وەزارەتی دەرەوەی نەمسا لەبارەی کوردەوە ئاگادار دەکاتەوە: ((بەپێی سەرچاوە

تورکییەکان و ئەو بەڵگانەی بە دەستم کەوتوون، لە ڕوودانی قەتلوعامێك دەترسم کە لە دنیادا ڕووی نەداوە.))

بەداخەوە، پێشبینییەکانی ((ڤێنتەر)) هاتنەدی و دەوڵەت ئەو کەتنەی لە دەرسیم ئەنجام دا کە لە دنیادا وێنەی نەبوو... ئەو داگیرکەرانە، مرۆکانیان، دانیشتووانی دێکان و بە ژن و منداڵ و پیر و گەنجەوە، دەکردە ناو خانووەکانیانەوە، یان کادێن و ئەشکەوتەکانەوە، ئەوجا ئاگریان دەدان، یان دینامێتیان پێیاندا دەتەقاندەوە، بەوەشەوە نەدەوەستان لاشەکانیان بەر گوللە دەدان و بە سونگی و نێزە سکی ژنانی سك پڕیان هەڵدەتلیشان.. هەر مرۆڤیان نەدەکوشت، مەزراو دارستان و پەڵە دەغلّ و باغ و باخچە و خەرمانیان دەسووتاند، تا ڕقیان لە ئاژەڵیش دەبووەوە و گوللەیان پێوە دەنان، منداڵی قومات و شیرەخۆرە، کچی عازەب، بووکیان دەکوشت، هەر شتێك زیندوو بووایە لەوێدا کوشتیان.. ئەو کاتە و ئێستاش ئەمە بە قارەمانێتی دادەنێن.. لەم سەدەی بیستەمدا گەلێك بەڵگە و دیکۆمێنت بەدەستەوەیە کە کورد جینۆساید کراوە و دەکرێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بەڵگە و ڕاستییە شاراوەکان باشتر دەردەکەون لەم ڕووەوە، بەڵام ئەو بەڵگە و ڕاستییانە پەرش و بڵاون و کۆنەکراونەتەوە، بۆ ئەوەی کات لەدەست نەچێ، دەبێ ئەو بەڵگە و دیکۆمێنتانە ئەرشیف بکرێن، دەوڵەتەکانی لێ ئاگەدار بکرێتەوە. هەنگاونان بەرەو کارێکی ئاوا زۆر پێویستە، ئەمەش دەبێ هەموو لایەك خەمی بخوات و بیکەنە کارنامەی خۆیان...

* * *

ئەم ڕیپۆرتاژانەی ناو ئەم کتێبە، لە بنەڕەتدا بە کرمانجی ژووروو بوون. سیان لەو ڕیپۆرتاژانە کاری من نین، ئەو بەڕێزانە، لەگەڵیاندا دواون و تۆماریان کردوون، ئەو کاسێتە تۆمارکراوانەیان ڕادەستی من کرد، منیش هێناومنە سەر نووسین، لەگەڵ ئەوانەی خۆمدا بۆ تورکیم تەرجەمە کردن و لەم کتێبەدا لەگەڵ ئەوانی تردا چاپم کردن.. سوپاسی ئەو برادەرانە دەکەم.. دەبێ ئەوەش بڵێم، لە بەتاڵکردنی

کاسێتەکاندا دەستکاری ماناکانم نەکردوون، تەنیا هەندێك دووبارەکردنەوەکانم لێ لاداون، وشە بە وشەش تەرجەمەم نەکردووە، ئەوەندە لە توانامدا بووە، هەردوو دەقەکەم لێك نزیك کردوونەتەوە.. دەبینن تەنیا کێشەکان لە نێوان داگیرکەر و داگیرکراودا نییە، ناکۆکی و بارودۆخی ئەودەمەی دەرسیم لەلایەك و نێوان دەرسیمییەکان خۆشیان لە ڕیپۆرتاژەکاندا دەردەکەون.. لەناو خۆیاندا ناکۆکی و خیانەتکاری هەبووە، گەلێك کەسیان لایەنگری و پشتگیری داگیرکەری کردووە، بۆ مێژوو ناوم هێناون... خەبەریان لە یەکتر داوە، کەوتوونەتە پێش لەشکری تورك ئەو دۆڵ و ئەشکەوتانەیان دەستنیشان کردووە کە خەڵکە سیڤلەکە خۆیان تێیاندا دەشاردەوە.. لەو کارەسات و قەتل و عامە تەنیا دەرسیم و دەرسیمییەکان زیان بەخش نەبوون. ئەو کەوا شۆڕانەش هەموویان وەکو دەرسیمییەکان زەرەر و زیانیان بەرکەوت و بۆ شوێنە دوورەکان ڕاگوێزران، هەندێك لەوانە زۆریش یارمەتی سوپای تورکیان دابوو.. کابرایەکی وەکو ((ڕایوەر قوپ)) ساڵەهای ساڵ بوو لە خزمەتی جەلادەکاندا بوو، کەچی سەری کەوتەبەر پەتی سێدارەیان.

لەم هەوڵەمدا ویستوومە، ئەوەی لە وڵاتەکەمدا ڕوویانداوە بخەمە ڕوو، خوێنەری لێ وەئاگابێنم.. بمانەوێت و نەمانەوێت ئەمەیە ڕاستییەکان، چاو لێ نوقاندنی سوودی نییە، دەبێت بوێر بین بۆ ئەوەی حەقیقەت بخەینە بەردەستی میللەت، نەك هەر بۆ زانین، بەڵکو دەرسیان لێوەرگرین.

بە ئومێدی گەیشتنمان بە ڕۆژی ئاشتی و ئازادی، هیوادارم ئەو ڕۆژانەش نزیك بن.

- مونزور چەم -

## (هەڵخەڵەتاین)

م. ژێلە*: لەبارەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٣٨ز چیت لەبیرە؟ ئەو ڕۆژانە چیتان بەسەرهات و چیترت گوێ لێبووە؟

جبراییل: سوپا ساڵی ١٩٣٨ز، چیای ((ژێلە))یان داگیرکرد، کە لەوێ مانەوە، ڕووداوەکان دەستی پێکرد، باوکم و دایکم گەلێ جار باسی ئەو ڕۆژانەیان بۆ دەکردین.

**باوکم دەیگوت:**

سەربازەکان هەر چوونە سەر چیاکە، هاتنە دێکەمان، پیانگوتین: زەوییەکانتان بەناو خۆتانەوە تۆمار دەکەین، ئەم کاغەزانەمان بۆ ئیمزا بکەن.. ئێمەش، نە زمانی ئەوانمان دەزانی، نە خوێندەواریمان هەبوو، بەڵام ناچار بووین ئیمزای بکەین. پەنجەمانیان بە هیسی چراکاندا ناو دواجار پەنجەمان خستە سەر کاغەزەکەیان.

زۆری نەبرد هەمدیس هاتنەوە، وتیان چەکەکانتان دەبێ تەسلیم بکەن، ئیتر هیچ کێشەیەکتان لەسەر نامێنێ، دەوڵەت هیچتان پێ ناڵێ و کاری بە ئێوەوە نییە، بۆ ئەمەش نارەزاییمان دەرنەبڕی، چەکەکانمان تەسلیم کرد. دێکەمان حەفتا پارچە چەکی بەدەستی خۆی بۆ چیای ژێلە برد.. ئەو فەرماندەیەی چەکەکانی وەردەگرت ناوی ((مومن)) بوو.. سەرجەم دێکانی ((حەیدەران)) وەك ئێمەیان کرد، دێهاتەکانی دیکەی ((حەیدەران)) هەموو وەکو ئێمە چەکەکانیان تەسلیم کرد. هەبوو چەکی ڕادەستیان نەکرد، بەڵام دێکەی ئێمە چەکی تێدا نەما.. تەنیا سێ ڕۆژ بەسەر تەسلیم کردنی چەکەکاندا تێپەڕی دیسان پەیدا بوون.. ئەمجارە چیتان دەوێت؟ وامان پێگوتن..

---

* م. ژێلە، لەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵ، (جبراییل حەمێ دولدی)دا، کردووە کە خەڵکی حەیدەرانی ناوچەی دەرسیمە لە دێی ((کاگلیغ)) لەسەر کاسێت تۆماری کردووە، دوای هێنانە سەر نووسین بە تورکیم کردووە. (م. چەم).

وتیان: ئەم دەوروبەرە قەدەغە کراوە، نابێ کەسی تێیدا بمێنێتەوە. بۆ ڕۆژئاوای ڕووبارەکە بڕۆن، لەوبەر بچنە نێو دێهاتەکانی خۆزی ((ئالان))، لەوێدا هەر یەکە و ناسیاوێکی هەر هەیە دالّدەتان بدات و جێگەی خۆتان بکەنەوە.. وایانگوت. لە نێوان خۆماندا کەوتینە مقۆمقۆ و والاّورد، بڕۆین، نەڕۆین.. دواجار، وتمان مادام چەکەکانیان لێسەندین، تەواو هیچمان پێ ناکرێ، واچاکە دێکەش بەجێ بهێلین.. بڕیارمان دا بڕۆین. دێکەمان چۆلّکرد، باروبنەمان لێکنا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، چووینە نێو ناسیاو و خزم و خوێشی دێکانی ئەوبەر. ئەو دێیەی ئێمە بۆی چووین، ناوی ((وان کۆك)) بوو دنیا هاوین بوو.. گەرمە، هەرچۆنێ بوو کەپر و ساباتمان بۆ خۆ دامەزراند و دانیشتین..

وا، لە ((وان کۆك))ین، سەربازەکان پەیدا بوون، موختاریان ڕاسپارد، حەیدەرییەکان کۆببنەوە، کارمان پێیان هەیە.. (مستو)ی موختار کۆی کردینەوە، جەندرمەکان وتیان: لە ((مەزگەرد)) زەویتان دەدەینێ، دەبێ بۆ ئەوێتان بەرین.. بەمجۆرە، حەفتا پیاوی ((حەیدەرانلی)) تەنیا دوو جەندرمە کەوتە تەکمان، دلّم کەوتە سێ و دوو، گومانم پەیدا کرد، بە ئەسپایی وتم: برایان ئەم کارە بێ مەلاّمەت نییە، ئێمە نابەن تا ئەرزمان بدەنێ، ئەمانە نیازیان خراپە، ئەمانە دەمانکوژن،.. ئێوە بڕوانن لە پێشدا چەکەکانیان بردین، ئەمجا لە دێکەی خۆمانیان دوورخستینەوە، ئەمە پلانێکە و داڕێژراوە، وەرن با ئەم دوو جەندرمەیە چەکەکانیان لەدەست دەربهێنین و ڕوو لەو شاخانە بکەین، لەوێدا ماوەیەك خۆمان ون دەکەین دواجا بەگوێرەی بارودۆخەکە ڕەفتار دەکەین.. یەکێکمان تێیدا بوو، ((عەلی مومید))یان پێ دەگوت، بە دەنگی بەرز هەلّیدایە: دەی بیانخەلّەتێنە.. دەولّەت ئێمە بۆ دەکوژێ، چیمان کردووە؟ کەوای گوت، ئیتر ئەوانی دیکەش خاوبوونەوە، بەرەو ((مازگەرد)) کەوتینەڕێ.. گەیشتینە مازگرد، تەماشامان کرد، وا ئافرەتێك بەرەو ڕوومان هات، منداڵێکی بە کۆلّەوەیە و دوو سەتلّە ئاویشی هەلّگرتووە..:-

- وای دایکتان بمریٚ.. ((دەمەنانیەکان))یشیان هیٚنابوو گوایە ئەرزیان پیٚدەدریٚ، ئالیٚرەدا هەموویانیان کوشت، ئەوانیش وەکو ئیٚمە شەڕیان نەکردبوو، کەچی گوللەبارانیان کردن..

کە وای گوت، ڕووم کردە هاوڕیٚکانم و جمیٚنم پیٚدان، وتم: پیٚم وتن دەمانکوژن، با نەڕۆین، کەس گویٚی لیٚنەگرتم، بە قسەی منتان نەکرد دەبا هەموومان بکوژن..

لە شویٚنیٚکدا ڕایانگرتین، لەولامانەوە چادر هەڵدرابوو، سەربازەکان لەویٚ بوون. سەربازیٚك لە یەکیٚك لە چادرەکانەوە دەردەچوو و دەچووە ژوورەوە، دەگریا، لە ناوماندا ((مستۆ)) تورکی دەزانی، پیٚمانگوت: ئا بزانە ئەو سەربازە بۆ وا دەگری؟

چادرەکە نزیکمان بوو، چوو لیٚی پرسی بوو وتبووی:

- بۆ ئیٚوە دەگریم.. بڕۆنە ئەو چادرەی ئەولا، ((جەلال بایار)) لەویٚدایە، بپاڕیٚنەوە با چارەیەکتان بکات..

ئیٚمەش ڕوومان کردە ئەو چادرەی ((بایار))ی لیٚبوو، بەر لەوەی ئیٚمە بگەین، ئەو بە پەلە پەل سواری جیبیٚك بوو بەرەو (ئەلەزیز) کەوتەڕیٚ.. بیٚ گومان لەویٚش بووایە، نەیاندەهیٚشت چاومان پیٚ بکەویٚت. پاش کەمیٚك ئەو سەربازەی بۆ ئیٚمە دەگریا، دیسان بینیمان دەگریا.. بە ئاستەم پیٚیڕاگەیاندین، تەلەفۆن کراوە، گەورە و بچووکتان بکوژین.. لەم کاتەدا، سەربازەکان هاتن، بە تانیەکیان ڕاخست و کۆمەڵیٚك نانە ڕەقی کەڕو لیٚدراویان بۆمان هەڵڕشت.. کە ئەمەمان بینی هەندیٚکمان ئومیٚدی پەیدا کرد کە نامانکوژن.. وتیان:

- بڕوانن، نانمان دەدەنیٚ، دیارە نیازی کوشتنمانیان نییە.. هەندیٚکمانیش دەیگوت:

- بەم نانە ڕەقە کەڕو لیٚدراوە دەمانخەڵەتیٚنن..

لەم کاتەدا ئەو سەربازەی بۆ ئیٚمە دەگریا بۆ لامان هات:

لە نیٚوانی خۆماندا وتمان: ئیٚمە دەکوژریٚین، دەبا هەرچی زیٚڕ و پارەیەکمان لەلایە بەم سەربازەی بدەین.. پارەو زیٚڕەکانمان کۆکردەوە، لە دەسەسڕیٚکمان ناو بەو

سەربازەمان دا، بەڵام وەرینەگرت، ئەمجا دوو دوو بە یەکەوەیان بەستینەوە، دەستم لەگەڵ دەستی براکەمەوە بەسترابوو.. مستۆ، لەبەر ئەوەی تورکی دەزانی لە دوای گشتەوە لەگەڵ سەربازەکاندا بوو، کەوتینە ڕێ، گەیشتینە سەر کانییەك، ئەو سەربازەی بۆمان دەگریا نەیهێشت لە کانییەکە ئاو بخۆینەوە، ئێمە سەرمان لەمە سوورِما، بۆمان دەگری و ناهێڵی ئاو بخۆینەوە!، تۆمەز سەربازەکە بە مستۆ دەڵێت: دەزانی لەبەرچی نەمهێشتن ئاو بخۆنەوە؟.. حەزرەتی حوسێن لە کەربەلا بە تێنوویەتی شەهید کرا، ئاویش بخۆنەوە هەر دەتانکوژن. دەبا وەکو حەزرەتی حوسێن شەهید بن کە نەیانهێشت ئاو بخواتەوە.. ئەوجا زانیمان، ئەو سەربازە عەلەوییە، بۆ ئەو شوێنەیان بردین کە پێی دەڵێن ((کەرتی مەزگەردی)). لەوێ بەریز ڕایانگرتین.. من دەستی خۆم شلکردبووەوە.. تەقە دەستی پێکرد، هەریەکە و لە شوێنی خۆی کەوتە سەر ئەرزەکە، هەبوو گوللەی بەرنەکەوت، من یەکێك لەوانە بووم.. وتم، وەلی برام دەستم کراوەتەوە وا هەڵدێم.. وەلی وتی: ناتوانی دەستم بکەیتەوە؟.. چەقۆیەکم لە گیرفاندا بوو، گورجێ لە پەتەکەی دەستیم ناو قرتاندم، لەو کاتەدا، وەلی گوللەیەك بەر شانی کەوت، بەڵام بە سووکی بریندار بوو بوو.. وتی:

- تۆ بڕۆ، ڕاکە با بەر نەکەوی...

هەستام، تا هێزم تێدا بوو ڕامکرد.. گوللە بەملاو ئەولامدا دەڕۆیی.. چەند جارێ کەوتم و هەستام، تا دوورکەوتمەوە.. باش بوو لێڕەوارێك نزیك بوو، خۆم خزاندە لێڕەوارەکەوە، زۆری نەبرد، وەلی برام پەیدا بوو، گوللەیەك بە ئاستەم شانی بریندار کردبوو.. لەگەڵ براکەمدا یەکمان گرت.. گەیشتینە شوێنێك پێی دەڵێن ((وان کوگی))، لەوێ ئاسیاوێکی کۆنمان بینی، چووینە ناو ئاسیاوەکەوە، شەو داهات، دنیا مانگە شەو بوو.. وتم:

- برا تۆ لێرەبە، من دەچمە دێکە، تا موختار ئاگای لەم کەین و بەینە نییە، منداڵەکان قورتار دەکەم، ئەو کابرایە بەمە بزانێت ئامانی نییە، ئەوەی ماوە خۆی دەیکوژێ... وام پێگوت و کەوتمەڕێ، خۆم گەیاندە کەپر و خانۆچکەکانی خۆمان.

ژنەکان لە سەربان خەوتبوون ((یووسف))ی برای موختار، لەو بانەوە ئێشکی دەگرت، ئەو خانۆچکانەی ئێمە لەسەر ڕێگاکە بوون، لە پشتەوە بۆی چووم.. یووسف بینیمی، بەڵام نەیناسیم. دەنگی لە خێزانەکەم کرد..

- بەسێ، بەسێ.. یەکێك وا بەرەو ماڵی ئێوە دێ.. وایزانیبوو من خەڵکی دێکەیانم.. چوومە ژوورەوە هەمدیس، یووسف لەو بانەوە هاواری کرد: ئەوە کێ بوو؟

- کەس نییە براکەمە...

بەسێ وای گوت.. زۆری نەبرد ((وەلی))یش پەیدا بوو.. یووسف، دیسانەوە دەنگی هەڵبڕی: ئەوە براکەت بوو، ئەی ئەمەیان کێیە؟.. وای گوت و خۆی نەگرت، هاتە لامان..

- کوڕە ئەوە چ بووە؟.

- کوشتمانیان.

- لە کوێ؟

- لە کەرتی مازگەردی..

وەلی وتی: زامدارم...

وتی: بڕۆ.. مستۆ بتبینێ دەتگرێ و تەسلیمت دەکاتەوە، بڕۆ.. بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ...

کە وای گوت، براکەم هەستاو لەوێ دوورکەوتەوە، منیش دوای کەمێك چوومە لای یووسف، وتم.

- یووسف..؟

- فەرموو..

- دەست و پات ماچ دەکەم، کوڕەکەم لەگەڵ خۆمدا دەبەم، با ئەم کوڕەمە قورتاری ببێت و نەیکوژن.. دەزانم بۆ ئەوەی پەزەکانمان ببەن هەموومان دەکوژن.. کوڕە گەورەکەم دەبەم و دەڕۆم.. وتی:

- ناهێڵم کوڕەکەت ببەیت.. دەڕۆی خۆت بڕۆ.. ناڕۆی ئەوا مستۆ ئاگادار دەکەمەوە تا بتگرێ و ڕادەستی قەرەقوڵت بکات..

چەندی لێ پاڕامەوە سوودی نەبوو. هەستام، بەڵام زۆر دوورنەکەوتمەوە.. دانیشتم چاوەڕێی ئاوابوونی مانگم کرد. کە مانگ ئاوابوو، خۆم کردە کادینەکەوە- منداڵەکانیان هەموو لەوێدا دەست بەسەر کردبوو-ناوەوەی کادێنەکە تاریك بوو، منداڵێکی زۆر لەوێ خەوتبوون، بەسەریانا گەڕام، تا کوڕەکەی خۆمم دۆزییەوە.. بە ئەسپایی لە باوەشم گرت و دەرمکرد.. لەولای ئاواییەکەوە شوێنێکی چەپی لێبوو، لە نێوان تاوێرەکاندا دانیشتین.. حەزم نەکرد بەو تاریکییە ڕێ لەبەر بنێم، ئێمەش خەڵکی دەڤەرەکە نەبووین و ناشارەزا بووین، وا (حەمید)ی کوڕم لەلامە دانیشتم و چاوەڕێی ڕۆژم کرد. خۆرهەڵهات، گوێم لە ژاوە ژاوە، من لە دێکە دوور نەکەوتبوومەوە، دەژنەوم چ دەڵێن.. (کوڕەکەی ڕفاندووە.. بکەونە دووی و بیگرن..).. زۆری نەبرد، یەکێ بینیمانی.. زوو وتم:

- ئاوەرە.. زێڕێکم پێیە، با بە تۆی بدەم.. دەنگ مەکە.. لێی پاڕامەوە.. بەڵام ئەو بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

- وەرن وەرن والێرەدایە، لەبن ئەم تاوێرە خۆی شاردووەتەوە..

کۆمەڵە کەسی پەیدا بوون، مستۆ لە پێشەوەیانەوە.. دەستمیان بەستەوە، کوڕەکەمیان خستە دووم، بۆ ماڵی ((مستۆ قالاڵی)) بردمیان.. لەوێ لەبەردەم ماڵەکەیاندا بەرزاییەك هەبوو لەوێ دایاننایین.. مستۆ، دیاری نەما، زۆری نەبرد گەڕایەوە، دارێکی بەدەستەوەیە، هەر کە گەیشتە لام دارێکی بە پشتما کێشا. کوڕەکەم خۆی بەسەرمدادا و دەستی بە گریان کرد، بە یەك دوو کەس کوڕەکەیان لێ دوورخستمەوە و کەوتنە لێدانم. وتم:

- مستۆ.. ئەو پیاوانە شایەت بن.. دەستم بکەرەوە با من و تۆ وەك پیاو ڕووبەڕووی یەك ببینەوە.. ئەگەر توانیت بمکوژیت، گەردنت ئازابێت..

کە وام گوت، دارێکی دیکەی بە پشتمدا کێشا.. لەم دەمەدا، براکەشمیان هێنا، دەستی ئەویشیان بەستەوە و بۆ لای قەرەقۆلیان بردین.. بەر لەوەی بگەینە ((شارەدێکە))، لە ڕێگا دوو گەنجمان تووش هاتن.. وتیان:

- مستەفا ئەم پیاوانە بۆ کوێ دەبەن؟

مستەفا وتی: هاوڕێکانیان لە ((مەزگەرد)) کوشتوون، ئەم دووانە هەڵاتوون، دەیانبەم تەسلیمیان دەکەم.

- خەڵکی کام ئاوایین؟

- لە بنەماڵەی ((حەمیٚ ئۆسین)).

- نەکەی.. حەیف، گوناحن، دەیانکوژن.. وەرە دوو تەقە بە ئاسماندا بکە و بڵێ لە دەستم هەڵاتن و نەمتوانی بیانگرم.. خۆ ئەوە یەکێکیشیان زامدارە..

مستۆ، ڕازی نەبوو..

وتم: براکان ئێوە خەڵکی کوێن؟

یەکێکیان وتی: گۆمی مشیم...

وتم: لەم سەگە مەپاڕێنەوە برا...

کەوتینە ڕێ، گەیشتینە ((پاغ)) بەڕێوەبەری شارۆچکەکە بینیمانی.

- مستەفا ئەمانە چین؟.. کێن؟.

- هەردووك بران.. دانیشتووانی دێکەیان لە مەزگەرد کوشتوون، ئەمانە ڕایانکردووە...

بەڕێوەبەری شارەدێکە، لە مستۆ نزیك بووەوە، تا هێزی تێدابوو زللەیەکی لێدا.. نە یەکێکی تر سێ و دووی لێنەکرد... وتی:

- کوڕە هەی سەگی کوڕی سەگ.. لە قەتلوعامەکەی ئەرمەنییەکان ئەرمەنییەکانتان داڵدە دەدا و قورتار دەکرد، ئەمانە خۆ لە دینی تۆیە، یەکتر دەناسن، بۆ هێناوتن؟! دەزانی سەرباز هەموو لایەکی گرتووە و ئەمری کوشتنیان دەرچووە.. باشە من ئێستا چی لەمانە بکەم؟ چۆنیان بەرەڵڵا بکەم؟!

نازانم چۆن پاش ماوەیەك، مستەفا هاتە تەنیشتمەوە، دەستمانی كردەوە.. مستەفا ڕۆیی، ئەو ڕۆیی، ئێمەیان لە قەرەقوڵەكە دەركرد و لەبن دیوارێك دایاننناین.. دەنگی تەقەمان جاروبار دەهاتە بەرگوێ... لەو ڕۆژانەدا هەركەسێكیان چنگ بكەوتایە، كۆیان دەكردنەوە و دواجار بە یەكەوە گوللەبارانیان دەكردن..

براكەم قۆڵێكی شكابوو، نەیدەتوانی جگەرە تێبكات. ئوسێ (حسێن قلیج) دەیخستە نێو لێویەوە و دەگەڕایەوە شوێنی خۆی و لێمان دووردەكەوتەوە. ئێمەش هەموو جارێك لێمان دەپرسی:

- تۆ چۆنی دەبینی، ئەمانە دەمانكوژن؟..

ئەویش دەیگوت:

- كەمێكی تر سەربازەكان پەیدا دەبن و دەتانبەن و بە نێزە دەتانكوژن..

دەمەو ئێوارە سەربازەكان هاتن، یەكێكیان چووە ژوورەوە، یەكێكیشان لەسەر كورسیەك لەولامانەوە دانیشت.. بە براكەمم گوت:

- نامەوێت پێت بڵێم ڕاكە، بەڵام من نیازی هەڵاتنم هەیە. كە ڕاشبكەم تەقەم لێدەكەن، ئەگەر پێكرام ئەوە هیچ، ئەگەر پێوە نەبووم، فرسەت لەدەست مەدەو تۆش ڕاكە...

نیازی ئەوەشم هەبوو، هەستم و تفەنگەكەی سەربازەكە وەدەست بهێنم، بەڵام دواجار وازم لەمەیان هێنا. گەنجە و بەهێز دیارە، دەتوانێ بمگرێ تا ئەوانیتر دێنە هیمدادیەوە، دەمكوژن..

هەر كە ئەوەم بە براكەم گوت، لە شوێنەكەی خۆمەوە هەستام و ڕامكرد، سەربازەكە تەقەی كرد، بەڵام نەیپێكام، كەمێ دوور كەوتمەوە، ئاوڕم دایەوە، براكەشم بە ڕاكردن دەهات، بەڵام قۆڵەكەی تریشی گوللەی بەركەوتبوو.. بەو حاڵەوە نەوەستاین تا دەشتاییەكەی ((پاخ)).. لەو تەقە لێكردنەمدا گوللەیەك بەر تاوێرێك كەوتبوو پارچە تاوێرێك بەر پووزم كەوتبوو، قاچم گران بوو، بەڵام ڕانەوەستام زۆرم لەخۆ كرد، تاماوەیەك هەروا بووم، بەڵام بەرە بەرە لەبیرم كرد. توومەز، سەربازەكان

خۆیان ئامادە دەکەن شوێنمان کەون، بەڵام بەرێوەبەری شارەدێکە پەشیمانیان دەکاتەوە.. هەرچی چۆنێ بوو، خۆمان گەیاندە نزیکی ماڵی {خدێ عەلێ قولێ} لەوە بەولاوە توانای ڕێکردنمان نەبوو. لەوێ دارستانێك هەبوو، چووینە ناو دارستانەکەوە. بە خۆمان گوت: سەربازەکان لە دوامان بێن دەمانگرن نەهاتن وا ڕزگارمان دەبێت.. تاریك داهات، چووینە ماڵەکەوە. گوێمان بە برسێتی نەدەدا، پەرێشانی ئاو بووین.. پیرەژنێك جامێك دۆی بۆ هێناین، هەموومان خواردەوە.. دواجار وتی:

- هەستن بڕۆن.. بە بۆنەی ئێوەوە ئێمەش دەسووتێین.. هەستاین، لە چەمی ((هەرجیغە- Hercik Cayi)) پەڕینەوە و لەو ناوە دوورکەوتینەوە.

I I

لەلایەکی ترەوە، مستێ قەڵاڵی ڕۆژێك دوای ئەوەی ئێمەی تەسلیمی قەرەقول ((پاخ)) کرد، جارێکی کە دێتە قەرەقوڵ و دەڕواتە لای ئەفسەرەکە و دەڵێت:

- پیاوەکان کوژران. ژن و منداڵەکان لە دێکەدان، سبەی دوو ئەمانیش هەڵدێن.. وەرن لەناویانبەرن و بیانکوژن.. بەڕاستیش فەرمانی کوشتن درابوو، ئەوانیش چاوەڕێی شتێکی وایان دەکرد. دوو جەندرمە لەگەڵیدا دەنێرن. هەموو ئەو ژن و منداڵانە دەبەن بۆ ((دۆڵی وانکوجی)) و هەموویان دەکوژن.

لەلایەکی ترەوە، ئەو ڕۆژەی ئەو پیاوانەی ((حەیدەرییەکان)) لەگەڵ باوکمدا بۆ ((مەزگێردی))یان بردن و گوللەبارانیان کردن.. دایکم، باسی ئەو ژن و منداڵانەی بۆ دەگێڕاینەوە کە بردبوونیان بۆ ((دۆڵی وانکوج)):-

- ئەو ڕۆژەی پیاوەکانیان برد، هەواڵێك بڵاوبووەوە کە فەرمانی کوشتن بۆ هۆزی ((ئالان))یش دەرچووە، ئەوانیش دەکوژن. بۆیە لەگەڵ چەند کەسێکی ((وانکوجی))دا ڕامان کرد.. لەو سەرەوە دارستانێك هەبوو خۆمان لەوێدا شاردەوە.. لەوێ بووین، هەواڵێکی دیکەمان پێگەیشت:

- ((دەمانانییەکان و حەیدەرییەکان)) هەرکەسێکیان دەست دەوڵەت بکەوێت دەیکوژن، بەڵام فەرمانی مردن و کوشتن بۆ ((ئالانییەکان)) دەرنەچووە.. لەبەر ئەو دەنگۆیە، زۆربەی ((وانکوجییەکان)) گەڕانەوە جێگای خۆیان. هەندێك لەوانەی ئێمەش، منداڵەکانیان هەڵگرتبوو و هەڵاتبوون. لەگەڵ خزمانماندا یەکمان گرتەوە. ئێمە لە دارستانەکەدا خۆمان شاردبووەوە و چاوەڕێمان دەکرد. مستۆ قەلاڵی لەگەڵ سەربازەکاندا هاتنە سەرمان، کۆیان کردینەوەو هێنامانیان بۆ دۆڵی ((وانکوجی)). لەوێ بەر گوللەیان داین، بەڵام من نەمردم. زامدار بووم. دوای ماوەیەك هۆشم بە بەردا هاتەوە، تومەز بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێ هەستامە سەرپێ. مستۆ هێشتا نەڕۆیشتبوو، ویستبووی تەقەم لێ بکات، بەڵام چەند کەسێك نەیانهێشتبوو بمکوژێت. پێیانگوتبوو:

- ئەوە زامدارە، بابڕواتیش دەکەوێت و دەمرێت، بۆ گوللەی خۆت بە خەسار دەدەیت...

بەرەو ڕۆژئاوا ڕووبارەکە ڕۆیشتین، وەلێ مامت، چووبووە ((جوخور)) بۆ لای ((سلو ئاغا)).. دواجار سلۆ ئاغاشیان کوشت. لەم بەینەدا، خالۆت، لەگەڵ ((ئوسی)) و ماڵی مامتدا، دەچنە دێی ((قورتان)) و دەچنە ماڵی ((فەرێ حوسێ)).

بەو زامدارییەوە، هاتمە دێی ((قورتان)) و ئەوانم بینی. هەر زوو لەگەڵ ((فەرات))دا چووینە دێی ((گەڕەکە)) و چووینە ماڵی ((عەلی ئوسێ)). فەرات ئێمەی دایە دەستی ئەوانەوە. ئەویش بە شەو هێنامانی بۆ ((کەمەرێ نەرگز)) وتی، سبەی کە تاریك داهات دێم و دەچینە ئەو بەر ڕووبار.. سبەی پەیدابوو لە چەمی سەید خانۆ پەڕینەوە هاتینە تەرەفی حەیدەران، لێرەشەوە لەگەڵماندا هات تا گەیشتینە ((چەمی وەروژی)) ئەوجا گەڕایەوە.

# III

## با بگەڕێمەوە لای قسەکانی باوکم:

((من و براکەم، خۆمان گەیاندە ((دەمانییەکان)) کە لە چیاکاندا بوون. کابرایەك گوتی، بیکەن بە خاتری پێغەمبەر، ئەم کابرایە زامەکەی سەختە چارەیەکی بکەن.. تومەز ئەمە بە براکەی من دەڵێت.. ئاوڕم دایەوە ناسیم ((عەلی ئاغای دەمانانلی)) بوو.. هەندێك (کەرە)یان هێناو دەمی زامەکەیان بۆ چەور کرد، بەڵام هەستمان دەکرد، ساردن لەگەڵماندا چونکە ((دەمانانییەکان)) لەگەڵ دەوڵەتدا بوون..

ڕۆژێکیان گوێم لێبوو وتیان: سێ ژن پەیدابوون.. دووانیان منداڵیان هەیە و سێیەمیان منداڵی نییە.. ئەوەی منداڵی نییە زامدارە. بۆم دەرکەوت، ئەو سێ ژنە، یەکێکیان خێزانی براکەمە، یەکێکی خاڵۆژنمە و ئەوی دیکەیان خێزانەکەمە. کە خێزانەکەم منداڵی لەگەڵدا نەبێ مانای وایە منداڵەکانمیان کوشتووە... چەند کەسێکمان نارد، ژنەکانیان هێنا.. وەك چۆن بۆی چووبووم هەروا دەرچوو.. یەکێکیان خێزانی برایمی خاڵۆمە، یەکێکیان خێزانی براکەم بوو، ئەوی دیکەیان خێزانەکەم بوو..

چەند ڕۆژێکمان لای ((دەمانانییەکان)) گوزەراند، بەڵام زۆر سەغڵەت بووین.. خواردنمان دەست نەدەکەوت.. سارد بوو.. ڕۆژێك لێرەو ڕۆژێکی تر لە شوێنێکی دیکە بووین.

ڕۆژێك لە ژێرەوە، هەواڵێکمان پێگەیشت، کە سەربازەکان خۆیان ئامادە دەکەن بێن و ئابلۆقەمان بدەن.. ئەم هەواڵەمان پێگەیشت، جێگاکانمان گۆڕی، بەرەو چەمی ((ئیکسور)) کەوتینەڕێ و گەیشتینە چیای ((عەزیز عەڤداڵ)) بەفر هەموو لایەکی داپۆشیبوو، باوبۆران بوو... ((فندق))م کردبووە ناو جەواڵێك و دابووم بە شاندا. ((فندقە)) وتی: من جەستەم سڕ بووە...

بینیم دەنگیشی دەرناچێ، سەرماکە پەرێشانی کردبوو، بە پەلە یەکێکم بۆ لای (حەمێ جویێ کەژێ) نارد، پێی بڵێ ((حاڵ و مەسەلە لەمە عیبارەت))... ئەم ڕۆیی و ئێمەش بەردەوامین و ڕێ دەکەین، تەم بوو، چاو چاوی نەدەدی، بەڵام ڕێگەی بەر

پێمان دەبینی. بەردەوامیش بەفر دەباری.. لەپڕ ژاوەژاو و دەنگە دەنگێك هاتە بەرگوێمان.. نەخێر گوێمان هەڵخست یەكێك قسەی دەكرد.. كەمێك ڕۆیشتین دەبینین لە بن تاوێرەكاندا ئەشكەوت هەیە. تومەز ئاژەڵدارەكان دێنە ئێرە.. پەزەكانیان لەگەڵ خۆیاندا دەكەنە ئەشكەوتەكەوە، هەناسەی پەزو مرۆكان ئەشكەوتی گەرم گەرم كردووە... چووینە ئەشكەوتەكەوە.. هەر كە چووینە ناو ئەشكەوتەوە ((حەمەدیٚ جبراییل)) چی بكەن، ((فندقە)) پەرێشانە.

- كەچی دەكەی بیكە سەرما پڕوكاندوویەتی..

- بەرخێك سەردەبڕین، فندقە ئەم لێفەیەی پێوە دەئاڵێنم و لە هەر لایەكەوە بەرد دادەنێم، كە هاتەوە سەرخۆی لە جگەری بەرخەكە بخوات، سبەی ئەگەر سەربازەكان ئەم ناوەیان داگیر نەكرد.. بەڵام مەترسە هیچ نابیٚ..

كەوای گوت، چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، خۆم پێنەگیرا گریام..

- بە تەنیا جێی ناهێڵم.. كە مردیش با بمرێت دەسەڵات نییە.. منداڵەكەم بە لێفەیەك پێچایەوەوە خستمە ناو جەواڵێكەوە و كەوتینە ڕیٚ.. بەو جۆرە تا گەیشتینە ((دۆڵی باوایی))، لە پڕ دەنگی دوو تەقەمان بیست، لە خواریشەوە دوو تەقەی تر كرا، وادیاربوو ئەوە نیشانەبوو لە نێوانیاندا. گەیشتین تەماشا دەكەین ئاگریان كردووەتەوە، بەرخیان سەربڕیوە، نانمان خوارد، گەرم بووینەوە. حەمەدیٚ جبراییل ڕووی لە چیاكە كردو وتی: ((ئەی چیای ژێلە، زۆر سوپاس بۆ تۆ وا بەسەلامەتی گەیشتین..)).

ئەو زستانەمان لەوێدا بەسەربرد.. ((دەواپیلە)) و ((سەید حەسەن)) كە لە هۆزی ((ئاواسیان))ن لەگەڵماندا بوون. هاوین تێپەڕی كە پاییز هات پێی گوتم:

- تۆ لە بنەماڵەی ((ئوسێنیٚ نەخشی))ت، ((حەمەدی تورنە))ش لە خانەوادەی ((حەسەنی))یە، من ڕزگارم كردن، ئێمە دۆستی دێرینی یەكترین، لە باب و باپیرەوە دۆستین.. هەموو شتێكمان هەیە وەرە و لەگەڵ ئێمەدا بژی..

منیش وەزعەكەم پیٚ گوت...

- وا بۆ دوو ساڵ دەچێت پێکەوەین، هیچ نابێت.

دوای ئەم قسانە، بۆ ئەوێ ڕۆیشتین، نێوانی ((سەید حەسەن)) و ((حەیدەرانییەکان)) کۆك بوون، یەکترمان خۆش دەویست. زستانەکەشمان هەر پێکەوە گوزەراند، چووینە ناو بەهارەوە، ((سەید حەسەن)) برازاکەی بانگ کرد و وتی:

- بڕۆ بۆ دەوروبەری ((دەمەنان) بزانە کێ ماوە، کێ مردووە، سوپا لەوێ هەیە، نییە، زوو وەرەوە.

برازاکەی وتی: ناڕۆم.

سەید حوسێن ((خدێی هەمێ))ی ڕاسپارد، ئەویش وتی:

- ناڕۆم..

کە ئەوەم بینی، وتم: من دەڕۆم.. بیری ((دەمەنانییەکان)) دەکەم، دەمێکە نەچوومەتە ئەوێ.

بەڵام، ڕازی نەبوو.. بەزۆر، ڕازیم کرد، وتی: من تۆم بۆ ئەوە گل نەداوەتەوە، بەملاو بەولادا بتنێرم..

وتم: مەترسە، هیچ نابێ، ڕەنگە ئەوان ڕێ دەرنەکەن، بەڵام من شارەزام.

دەستبەجێ، خۆم ئامادەکرد، بەدامێنی چیاکاندا هەڵگژام، گرد و تەپۆڵکەکانم بڕی و گەیشتمە ئەشکەوتەکانی ((ئەرەکیە)). لەوێ چاوم بە ((دەمانانییەکان)) کەوت، ئەو شەوە پێکەوە بووین، قسەو باسێکی زۆرمان کرد.. پڕ دەسەسرێك نان ساجیان بۆ کردم و بۆ بەیانییەکەی گەڕامەوە.

بە ((زرقیە))دا سەرکەوتم، لە دوورەوە بینیم لە ماڵەکەی سەید حوسێنەوە دووکەڵ بەرزبووەتەوە. وامزانی ئاگریان کردووەتەوە، کە نزیك بوومەوە تەماشا دەکەم چۆڵ و هۆڵە و کەسی لێ نییە، ماڵەکان سووتێنراون، گەڕامەوە.. بە ((زرقیە))دا هەڵگژام، لەوێوە بۆ دۆڵی (وارتیغە)) شۆڕ بوومەوە، شەوم بەسەردا هات، دنیا تاریك بوو بوو، هەندێك جار پێم دەخزی و دەکەوتم.. بە هەر حاڵێك بوو خۆم گەیاندە ((وارتینگە))..
دێهاتەکان چۆڵکرابوون، و هەندێکیان هێشتا دووکەڵیان لێ بەرز دەبووەوە. دنیا کپ

و بێ دەنگە. ڕەنگە لە ئەشکەوتەکاندا خەڵکی هەبوو بێت بەس نەدەنگ دەبیسترا نە کەس دیار بوو.

تومەز، یەکێك لەوانەی یاخی بوو بوون و چووبووە چیاکان، خۆی تەسلیم دەکات و بە کوموتانی سوپا دەڵێت:

- ژنێك لەلای ((سەید حەسەن))ە، دەتوانم بتانبەمە ئەو شوێنە..

ئەوان چاوەڕێی شتێکی وایان دەکرد، کابرا دەکەوێتە پێشی هێزێکی سەربازی و دەیانباتە نزیکی ماڵی سەید حەسەن، بەو شەوە ئابلۆقەی ماڵەکەی دەدەن.. سەرباز، دەنگی لێ دەکات تەسلیم ببێت.. ئەویش چەك هەڵدەکرێت و دەکەوێتە تەقەکردن. تا فرسەتی بۆ هەڵدەکەوێت و دۆڵێك دەگرێت و خۆی ڕزگار دەکات.

## IV

دایکم، لەوێ دەبێت، ئاوای گێڕاوەتەوە:

سەید حەسەن کە چووە دەرەوە، ژنەکەشی کەوتە شوێنی، بەڵام گوللەیەك بەر قۆڵی دەکەوێت، لە دەرگا دەگەڕێتە دواوە. لە ماڵەوە دوو تفەنگ و دوو دەمانچەیان هەبوو، بیرمان کردەوە چۆنیان بشارینەوە. نەمان گەرەك بوو بکەونە دەستی سەربازەکان. لە دواییدا توانیمان لە سەرەوەی تەپانی دەرگاکەوە جێیان بکەینەوە، بەڵام تقەنگەکان جێگایان نەدەبووەوە.. لەم کاتەدا لە دەرەوە هاواریان کرد تەسلیم بن. ئەگینا تەقەتان لێدەکەین.. ناچار خۆمان بەدەستەوە دا، سەید حوسێن هەر تەقەی لێدەکردن.. سەربازەکان بە خوشکەزاکەیان گوت:

- بە خاڵۆت بڵێ تەقە نەکات و تەسلیم بێت. ئەگەر تەسلیم نابێت با تەقە نەکات.. ئەگەر وانەکات ئێوە دەکوژین..

خوشکەزاکەی بە دەنگی بەرز سەیدی تێگەیاند. لە بەرانبەر ئەمەدا وتی: تەسلیم نابم، بەڵام تەقەیان لێناکەم... سەید، چەکەکەی فڕێ نەدا، سەربازەکانیش ئێمەیان لەوێ دوورخستەوە. چووینە قەراغ ڕووبارەکە. لە شوێنێکی تەسکی ڕووبارەکە.

لەجیاتی پرد دارێکی ئەستووریان دانابوو.. هەرسێکمان بە حاڵە حاڵ توانیمان بەسەر دارەکەدا بپەڕینەوە. من و فندقە، سەربازێك یارمەتی پەڕینەوەی داین، بەڵام خوشکەزاکەی سەید بە ئاوەکەدا پەڕییەوە. ویستی لەو ماوەیەدا خۆی بدزێتەوەو هەڵبێت، بەڵام بۆی نەکرا. سەربازەکان تەقەیان لێکردو کوشتیان، لەناو ئاوەکە کەوت، دواجار سەربازەکان لاشەکەیان هێنایە قەراغ، سەربان بڕی و سەرەکەیان خستە جەواڵێکەوە. کەکەی (خدو)شیان لە ئێمە جیاکردەوە، لەولاوە کوشتیان، سەری ئەویشیان بڕی و خستیانە جەواڵێکەوە. ئێمەش لەرزمان لێهات، دەترساین ئێمەش بکوژن.

گەیشتینە ((وجیخی)).. ئەو کابرایەی، خەبەری دابوو کە ژنێك لە ماڵی (سەید حەسەن)ە، وتبووی گەر ئەو ژنەم بدەنێ جێگای سەید حەسەنتان پێ نیشان دەدەم. ئەو ئافرەتە لێرەدا ڕووبەڕووی ئەو کابرایە کرایەوە.. ژنەکە، پێی ڕازی نەبوو شووی پێنەکرد.

ئێمەیان، دایە دەستی دێی ((زەرانیگە))وە. موختاری دێکە وتی:

- ئەو ئافرەتە منداڵی هەیە لە ماڵیش بچێتە دەرەوە دەبێت، ناتوانێت منداڵەکانی بەجێ بهێڵێت.. بەڵام ئەوانی دیکە نابێت دەرچن. ئێوە ڕادەکەن. با ئەم ژنە لە دێکەدا خواردنتان بۆ پەیدا بکات و بۆتانی بهێنێت..

لەو دێیەدا، هەندێك لە هۆزی ئێمەی لێبوو (حەیدەرییەکان)، خدرێ ئەفەندی خۆی کردە خاوەنی ئێمە. خدرێ ئەفەندی، باپیرەی (محەمەد عەلی ئەرەن)ە کە لەم دواییانەدا بووە ئەندامی پەرلەمان. ئێوارەیەکیان خێزانەکەی سەید حەسەن وتی:

- خوشکێ...
- فەرموو..
- نان ساجی بکەم.
- ئەگەر حەزت لێیە لەجیاتی یەکێك دووان بکە.

هەندێ هەویری شێلا. کوانووەکە هێشتا ژیلەمووی تێیدابوو، خستییە سەر ژیلەمۆکە تا برژا.. تومەز نیازی ڕاکردنی هەبووە.. سبەی کە هەستاین لەوێ نەمابوو.. شەو هەڵاتبوو، شوێنی سەید حەسەنی زانیبوو، خۆی پێگەیاندبوو..

-٧-

باوکم بە تەنیا لە چیاکاندا بوو، ڕۆژانی تەنیایی لە چیادا بەمجۆرە بۆی دەگێڕاینەوە:

- بەیانییەکیان، لە خەو هەستام، بڕیارم دا بۆ دێی ((حەیدەران)) بڕۆم.. وەختی خۆی دوو جەواڵ جۆم لەوێدا شاردبووەوە. هەندێك کاکڵە گوێزیشمان بۆ تەنگانە شاردبووەوە.. لە ((کاکلغ))یش دوو دەمانچەم شاردبووەوە... لە دۆڵی ((ئارەکیە)) زیارەتگایەك هەبوو، خەڵکی دەچوون زیارەتیان دەکرد، قوربانیان بۆ سەردەبڕی، لەوێدا لەژێر گابەردێکدا وەکو ئەشکەوتێکی بچووك هەبوو، چوومە ژێر ئەو گابەردەوە، لە سەرەوە دڵۆپ دڵۆپ ئاو دەهاتە خوارەوە هەموو ڕۆژێك چنگێك جۆم دەبرد و لەژێر دڵۆپە ئاوەکەم دادەنان تا نەرم دەبووەوە، لەگەڵ هەندێك کاکڵە گوێزدا دەمخوارد. سێ هەفتەم بەو جۆرە بەسەربرد.

ڕۆژێکیان، لەسەر تاوێرێك دانیشتبووم، لەپڕ ورچێك بە تەواوی لێم نزیك بووەوە. زۆر ترسام.. ماوەیەك ئاوا بەرانبەر یەکمان گرتبوو، دەیڕوانییە من.. هاتمە قسە و پێم گوت:

- برا.. یان هەڵسە بڕۆ، یان وەرە بمخۆ.. تەماشاکە. وا هەموو خەڵکەکە دەکوژن، منیش وەکو تۆ لەم دارستانەدا دەژیم. لەم چیایانەدا تەنیام و هاتووم لێرە دانیشم.. تۆ چۆن تەنیای منیش ئاوا تەنیام.. یان بڕۆ، یاخود وەرە بمخۆ سەربازەکان بێن هەردووکمان دەکوژن.. کە وام گوت.. یەك دووجار پراندی و وەك توویەکم لێ بکات هەرچی لیك و ئاو لە دەمیدا بوو بەرەو ڕووی من فڕێی دا و ڕۆیشت.

لەبەر خۆمەوە گوتم با سەردانێکی ((دەمانانەکان)) بکەم بزانم بۆ دیار نین. تۆ بڵێیت کوژرابن؟.. هەستام بەرەو دۆڵی ((ئیکسۆر)) کەوتمەڕێ، لە خوارەوە گردێك هەبوو، کە چوومە سەر گردەکە، تەماشام کرد لەبن دار گوێزەکاندا قەرەباڵغێك دیارە، منیان بینی دەستیان دایە چەکەکانیان، کە ئەوەم بینی بە پەلە گەڕامەوە، بە میلیشیا چەکدارەکانم زانین، لەو کاتەدا یەکێك دەنگی هەڵبڕی:

- کوڕە وەرە.. نەڕۆی خۆمانین.

دەنگەکەم ناسییەوە تومەز {عەلی ئاغای دەمەقاقلی}یە، گەڕامەوە.. دانیشتین و دەستمان کردە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانمان.

- چی دەکەی؟ چی ڕووی دا؟ چۆن ڕزگارت بوو؟

زۆریان هەوڵ دا لەگەڵیاندا بمێنمەوە.. پرسیم؟

- سەید حەسەن، نازانن لە کوێیە؟

- لێرەیە.. چووە ژوورەوە.. دەگری.

لە خۆشی گەڕانەوەی مندا دەستی بە گریان کردبوو.. هەستام چوومە لای. باوەشمان بەیەکدا کرد.. گریاین.. ئەوجا ئەوانی دیکە هاتن و بەیەکەوە دانیشتین و دەستمان بە باس و خواس کرد.

- دەڕۆم خۆم تەسلیم دەکەم..

ئەوەی بە سەید حەسەن گوت، بە دەمانانییەکانم نەگوت، ئەگینا دەیانکوشتم. دەیانگوت:

- هەرکەسێك هەڵسێت و بڕوات خۆی تەسلیم بکات، کەس لە چیاکان نامێنێت..

لێرەش زۆر نەمامەوە.. چوومە ((گورینجە)).. لەوێ کچێکم بینی نۆکی دروێنە دەکرد، منی بینی.. دەستی کردە هاوارکردن.

- وەرن دز.. ڕێگرە.. وەرن.

لە دواوە بانگم لێکرد:

- کچێ هاوار مەکە، من ناسیاوی ئێوەم.. تۆ ((کچی قەمەر)) نیت؟

کەوام گوت، ڕاوەستاو ئاوڕی دایەوە و وتی:

- باوکم چۆن دەناسیت؟

بۆم روونکردەوە، ئەوجا ئارام بووەوە.. لێرەوە چوومە ((پێیێی ڤیلی)) لەوێ ((مەمەدێ پیتالی)) موختاری ئەوێندەرێ بوو.. پێکەوە دانیشتین و قسەمان کرد، دواجار وتی:

- دەڕۆم پەڵەیە جۆمان هەیە درەوی دەکەم.. پێکەوە چووین، بەڵام توانای دروێنەکردنم نەبوو. چاوم پڕ بوو لە فرمێسك بینیمی، هاتە تەنیشتمەوە:

- بۆ دەگری حەمید؟ توانات نییە، یان حەز ناکەیت... یان دەردێکت هەیە، بۆ پێمان ناڵێیت.

- چۆن نەگریم؟ ژنی یەکەمم مرد.. کوڕێکم لەو ژنە هەبوو، سەربازەکان کوشتیان.. لەم ژنەکەی ترم کچێکم هەبوو، ئەویشیان کوشت. مناڵێکی ترمان هەبوو، وتم بەڵکو ئەمەیان بۆم دەمێنێتەوە، ئەویش ڕۆیی و کوژرا و نازانم لە کوێ کوشتوویانە..

موختار وتی: بڕۆ بۆ ماڵەوە من بۆ ((پاخە)) دەچم، ئەگەر ژنەکەت و منداڵەکان مابن، ئەوە هەوڵ دەدەم بزانم لە کوێن، کە زانیم دەچم دەیانهێنم.. وای گوت و ڕۆیشت..

بەڕێوەبەری شارەدێکە کە موختار دەبینێت: {ها.. خێرە موختار؟} موختار دەڵێت: حەنابی بەڕێوەبەر.. حەمیدی عەلی هاتووە، خۆی تەسلیم بکات، دەڵێت تا ژنەکەم و منداڵەکانم نەبینم، جارێکی کە دەچمە چیا..

- خۆی لە کوێیە؟

- دەزانم.. شوێنەکەی پێدەزانم.. خەبەری بۆ من ناردووە.. ئەگەر منداڵەکانی بۆ بهێنن خۆی تەسلیم دەکات.. ئەگینا دەگەڕێتەوە.. بەڕێوەبەر، تەلەگراف دەکات.. بەملاو بەولادا دەپرسێت و سۆراخ دەکات، پاش کەمێك بە موختار دەڵێت:

- سبەی دوو جەندرمە دەیانهێنێت وەرن بیانبەنەوە. ئەگەر نەیانهێنا بۆ کوێ دەڕوات با بڕوات...

بۆ سبەینێ موختار دەڕوات و ژنەکەی دێنێتەوە لەوێ مانەوە تا ڕێگای گەڕانەوەیان درا بچنەوە دێکەی خۆیان.

**دێکەمان ((ئاموتقە)) حەوت جار سووتێنرا**

مونزور چەم: ئێوە هەردووکتان کوڕی ((جەمشید ئاغان)) وا نییە؟

سەید خان: بەڵێ.. من کوڕی جەمشید ئاغام، ئەمەش خوشکمە ناوی ((یەتەرە))یە، خوشکی گەورەمە.

م. چ: جەمشید ئاغا، چی ((ئیدارە)) ئاغایە؟

- کوڕی ((ئیدارە)) ئاغایە.

- دەتوانیت هەندێك زانیاریمان لە بارەی خانەوادەی ((ئیدارە))وە بۆ باس بکەیت؟..

یەتەرە: باسی ئێستات بۆ بکەم، یان ڕابوردوو؟

م. چ: بە ئارەزووی خۆت.. لە کوێوە دەستی پێدەکەی من گوێت لێدەگرم..

یەتەرە: کەی بووە نازانم.. بەڵام ڕەنگە سەد ساڵ لەمەوبەر بێت، ئاغاکانی دەرسیم ((باج))یان لە هەندێك لەو دێهاتانەی دەوروبەر وەردەگرت.. ئاغاکان لە نێوان خۆیاندا دێکانیان دابەشکردبوو بۆ ئەو پارە وەرگرتنە.. ((دۆخکی))یەکان، لە ئێمەوە نزیك بوون، یەك دوو ئاوایی ئەو ((دۆخکی))یانە، کەوتبوونە لای ((ئیدارە)) ئاغاوە. هەموو ساڵێك بەو دێهاتانەدا دەگەڕا داهاتەکەی-باجەکە-ی کۆدەکردەوە..

م. چ: ((دۆخکی)) عەشیرەتە؟ بەچی زمانێك دەئاخاوتن؟

سەید خان: ئەوانە-دۆخکان-یان پێ ئێژن، {بە تورکی دۆغکان Dogkan}، یان ((دۆخکۆ))ی پێ دەڵێن. ئەوانە کوردن، بەڵام سوننە مەزهەبن، {بە کرداسکی-کرمانجی، م. چ} دەدەوێن، چونکی عەلەوی نەبوون، بۆیە ئێمە دەڵێین تورکن...

بۆ کۆکردنەوەی سالآنەی ئەو دێهاتانە، باپیرم ((ئیدارە)) لەگەڵ ((چاك))ی برایدا دەکەونە ڕێ.. دواجار ((چاك)) لە ئاوایی ((کویزم)) دەمێنێتەوە. کویزم، گوندی ((کویزم ئوغلو))وە و سوننەن، یانی تورك! بەلآم هەڵسوکەوتیان کرمانجە، یانی لە عەلەوییەکانەوە زۆر نزیکە..

م. چ: ((کوێزم ئوغلو)) تورکی سوننەیە یان کوردە و سوننەیە؟

-: کوردە، کرمانجە، بە کرمانجی دەدوێت، لەبەر ئەوەی سوننەیە ئێمە پێی دەڵێین تورك..

لەو دەمەشدا ((ئوسێن ئاغا))ش لە دێی ((کویزم)) دەبێت.. لە سەرووی ((کویزم))ەوە، دێیەك هەیە ناوی ((چەولیخ))ە.. ئەم ((چەولیخ))ە، دێی ((ئوسێن ئاغا))یە.. لە بنەڕەتدا ئەوانەش لە ((قۆچانییەکانن)) یانی لە هۆزی ئێمەن.. لەبەرچی بووە نازانم، لەوێدا ئوسێن ئاغا و (چاك) دەبێتە ناخۆشییان، دەمەقاڵێیەکەیان درێژەی نابێت، ئەوانەی لەوێ دەبن ناوبژییان دەکەن و دەکەونە نێوانیانەوە.. زۆر نابات ((ئیدارە)) پەیدا دەبێت.. ((ئیدارە)) چوار پێنج چەکداری لەگەڵدا دەبێت، ئیدارە ئاغاو براکەی، دێکە بەجێ دێڵن بەرەو ((ئاختوگە)) دەڕۆن.. کە ئەوان دەڕۆن ((کویزم ئوغلو)) لەگەڵ ((ئوسێن ئاغا))دا دەچنە (((چەمیش گیزەك)) شکات دەکەن و دەڵێن: ئیدارە ئاغا هات و بە زۆر ئاژەڵەکانمانی برد، وا ئێستا لە دێی ((ئاختوگە)) میوانە.. ئەو دەمە، ئەرمەنییە.. سەربازەکان دێن، لە دەرەوەی دێکە، بۆسەیان بۆ دادەنێن، بۆ سبەینێ ((ئیدارە ئاغا)) و ((چاك))ی برای و پیاوەکانیان لە دێکە دەردەچن لە نزیکی دێکە، گابەردێك دەبێت، دەگەنە ئەو ئاستە سەربازەکان، دەستڕێژیان لێدەکەن، ئیدارە و هاوڕێکانی لە پەڵە شینایییەکی ڕاستیدا دەبن.. (چاك) لەو دەستدرێژە زامدار دەبێت.. ئیدارە و چاك، خوشکێکیان دەبێت ناوی ((زین)) بووە، کە زامدار دەبێت بە یەکێك لە چەکدارەکان ناوی ((ئیڤی بەرتی)) بووە دەڵێت: ((فریام کەوە، نەهێڵیت دەستگیرم بکەن، بەڵێن بێت ((زین))ت لێ مارە بکەم... بە مردوویش نەهێڵیت لاشەکەم دەستی ئەوان بکەوێت.)).. کەوا

دەڵێت ((بەرتی)) هەوڵدەدات لێی نزیك بێتەوە، بەڵام ئەویش زامدار دەکەن.. ئیدارە ئاغاش، گوللەیەك بەر سەری دەکەوێت، بەڵام هەر ڕووکاندبووی زامەکەی سەخت نابێت، خوێن بەرچاوی دەگرێت و شەڕی پێناکرێت.. کوڕە مامێکی ئیدارە ئاغا هەر لەو شەڕەدا دەبێت، ناوی ((مچو)) دەبێت، هەرچی چۆنێك دەبێت، خۆی دەگەیەنێتە کڵیسەی ئەرمەنییەکان و هانا بۆ ((گوچ چو)) ئاغا دەبات، ئەویش لێی ڕاناوەستێت، دەچێتە هانای ئیدارە ئاغاوە. ((گوچ چو)) ئاغا، لە هۆزی ((فورات))ە، دەورەی سەربازەکان دەدات و دەیانگرێت و بۆ دێی ((تەتەر))یان دەبات.. تەتەر سەر بە ((چەمیش گیزەك))ە، لەو شەڕەدا ((چاك)) و ((بەرتی)) بەو برینەیانەوە دەمرن.. کە براکەی دەکوژرێت، ئیدارە ڕوو لە چیا دەکات ((کویزم ئوغلو)) و ((ئوسێن ئاغا)) کە ئەو کارەیان کرد، لەبیری دەرناچێت، هەوڵی تۆڵەسەندنەوەی دەدات.. ئوسێن ئاغا خۆی دەشارێتەوە، ئیدارە لەگەڵ چەند کەسێکدا ((حەمید ئاغا))ی برای ئوسێن دەگرن و دەیکوژن.. ئەمەش لە بنەڕەتدا بۆ ڕووداوێکی کۆنتر دەگەڕێتەوە... ((ئەسیل ئاغا))یەك هەبووە، کچی حەمید ئاغا، بووکی ئەو بووە.. نازانم ئەو کاتە لەبەرچی بووە، ئەو ((ئەسیل ئاغا))یە، دەکەوێتە پێش سەربازەکانەوە و دێن ئابڵوقەی دێکەمان ((ئاموتقە)) دەدەن شەڕ و پێکدادان دەست پێدەکات، لە یەکیچك لەو شەڕانەدا، ئامۆزایەکی ((ئیدارە ئاغا)) زامدار دەبێت، سەربازەکان بە زامداری دەستگیری دەکەن و سەری دەبڕن و بۆ ئەتك، دەیهێننە سەر بازگەیەك لە ((هۆزات)).

کابرایەك لە هۆزات ((سەرە براوەکە)) دەدزێت و دەیگەیەنێتە ((ئیدارە ئاغا)) پێشتر لاشەی بێ سەریان ناشتبوو، جارێکی تر گۆڕەکەی هەڵدەدەنەوە و سەرەکەی بە لاشەکەوە دەنێژن.. ((ئیدارە ئاغا)) دوای ئەوەش خۆی بە دەستەوە نادات، بەردەوام لەهەڵ دەگەڕێت و هێرش دەباتە سەر سەربازەکان، چەندساڵێك بەو جۆرە دەمێنێتەوە نازانم.. بەڵام لە کۆتاییدا ((نەشئەت پاشا)) فەرماندەی لەشکر دێتە ((کوێی مەران)) تورکییەکەی-ییلانلی داغ- ((چیای ماران)).. لەوێدا چادر هەڵدەدات، هێزێکی

دیکەش لە ((هۆزات))ەوە دێت، شەڕ دەست پێدەکات، بەڵام هیچیان پێناکرێت، بۆیە دەست بە فرت و فێڵ دەکەن..

((نەشئەت پاشا)) سەرۆکی هۆزەکانی ئەو دەڤەرە کۆدەکاتەوە، لەناویاندا یەکێك هەڵدەبژێرن، تا چاوی بە ئیدارە ئاغا بکەوێت. بۆ ڕازی کردن و خۆ بەدەستەوەدانی قسەی لەگەڵدا بکات!!، ئیدارە ئاغا، بڕوا بە بەڵێنەکانی نەشئەت پاشا ناکات.. ژنەکەشی پێی دەڵێت: خۆت بەدەستەوە نەدەیت.. ئەمجارە، سێ کەسی دیکە و قاسم ئوغلو مونزور دەنێرن، قاسم ئوغلو بە ئیدارە ئاغا دەڵێت ((سەربازێکی زۆر هاتوون، ئەم دەوروبەرەیان ئابڵۆقە داوە، ئەگەر خۆت ڕادەستیان نەکەیت خەڵکێکی زۆر لەناودەچن، گوناهەکەشی دەکەوێتە ئەستۆی تۆ.. ((ئیدارە ئاغا)) دوو دڵ دەبێت.. بەڵام دواجار بڕیاری خۆ بەدەستەوە دان دەدات.. هەرچەندە هاوسەرەکەی لێی دەپاڕێتەوە نەڕوات، بەڵام لە بڕیارەکەی پاشگەز نابێتەوە.. ئەوەش دەگێڕنەوە گوایە سەرەڕای ئەوەی قاسم ئۆغلۆ تکای لێ کردووە، بەڵام بە قسەی نەکردووە، گوایە دواجار، سەرەك هۆزەکان کۆمەڵێك ژن بۆ تکاکردن دەنێرن ئەوجا ئیدارە ئاغا قەناعەتی هێناوەو خۆی بەدەستەوە داوە...

هەر کە دەگاتە سەربازگەکە، دەیگرن و باڵ بەستی دەکەن.

یەتەرە: کە ئیدارە ئاغا دەگرن، دەیبەن بۆ ((هۆزات)) تورکەکان لەو بنکەی هۆزاتە دەبن، بەر لەوەش لەگەڵ ئیدارە ئاغادا شەڕ و ناخۆشییان لە نێواندا هەبووە، لەلایەن پیاوەکانی ئیدارەوە چەند کەسێکیان کوژراوە و زامدار بووە. ئیدارە، داوا لە قومەندانی لەشکرەکەی کردبوو، کەسی دیکەم لەگەڵدا بەند مەکەن، چونکی دوژمنایەتیم لەگەڵیاندا هەیە، نەکو دەستم لێ بوەشێنن.. بۆیە بە تەنیا بەندی دەکەن... هەر بەڕاستیش تورکەکانی هۆزات پلانی کوشتنیان بۆ دانابوو، جلی ژنانەیان لەبەر چەند پیاوێك کردبوو تا خۆیان لێ نزیك بکەنەوە و بیکوژن..

لەوێوە بۆ ((خەربوت-ئەلەزیز-)) دەیگوێزنەوە، لەوێش ڕایناگرن بۆ دیاربەکری دەبەن.

وەك من بزانم، لە پێشدا ئیدارە ئاغا لە بەندیخانەکەی ((ئەلیزیز)) دایدەنێن...

سەید خا: ئیدارە ئاغا، ڕازی نابێت لە دیاربەکر دادگایی بکەن. هەرچەند دەکەن، ئیفادە نادات، ماوەیەك ئاوا دەمێنێتەوە، هەندێك لە دەرسیمییەکان هەر لەوێ دادگایی دەکرێن، تکایان لێدەکەن، ڕازی بکەن تا ((ئیفادە)) بدات.. بەڵام هەرچەند هەوڵی لەگەڵ دەدەن بێ سوود دەبێت و هیچ شتێك بۆ دادگا ناڵێت.. لە دواییدا، مەلایەك لە هەمان بەندیخانەدا دەبێت، دەچێتە لای ئیدارە ئاغا و پێی دەڵێت:

((پیاوی چاك بە وەرە بۆ دادگا و ئیفادەکەت بدە.. تۆ ڕزگارت ببێت، ئێمەش ڕزگار دەبین و دەچینەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆمان..)).. یەکێك لەو بەندییانە ((دیاب ئاغا)) دەبێت.. ئەو دەمە ئەویش لە بەندیخانەدا بووە، لەبەر ئەمە ((ئیدارە ئاغا)) دەڵێت:

- ئەم ڕوولێنانەی ئێوە بە دواوە نادەم و ئیفادەی خۆم دەدەم.

بەمجۆرە، ئیفادە دەدات، لە ئەنجامدا حوکمی هەتا هەتایی بەسەردا دەسەپێنن، ئەوانی دیکەش ڕزگار دەکەن.. ئیدارە ئاغا، حەوت ساڵ لە زیندانەکانی دیاربەکر بەسەر دەبات، بەردەوامیش هەوڵی هەڵهاتن دەدات.. هەمیشە بەخۆی دەگوت:

- ((سەربازەکان براکەمیان کوشت، منیش لە بری هەر توکێکی سەربازێکم کوشتووە)).

حەوت ساڵ لە زیندان دەمێنێتەوە، پلانێکی تۆکمەی هەڵاتن دادەڕێژێت و خۆی ڕزگار دەکات، ئەویش بەمجۆرە بووە:

((برای بینباشییەکی ماردینی، لەگەڵ ئیدارە ئاغادا بەند دەبێت، گوایە دەڵێن، ئەو بینباشییە لەسەر کوردایەتی بەندکرابوو.. ئەوەی هەڵاتنەکەی دانابوو ((بینباشی))یەکە بووە. بەهۆی ئەو ماردینییەوە پێوەندی بە دەرەوە هەبووە.. لە نێوان دیاربەکر و سیڤارك گوندێك هەیە ناوی ((ئاخاجان))ە، یەکێك لە دانیشتووانی ئەو دێیەش بەند بووە، (دواجار ئەو پیاوە چەند جارێك بۆ ماڵمان هات) هەموو جارێك شتێکی ئەو ڕۆژگارانەی بۆ دەگێڕاینەوە.. پلان دادەڕێژن و ئامادەی هەڵاتن

دەبن. گاردیانەکە هەر کە دەچێتە قاوشەکەوە، ئیدارە، هەر بە نێزەکەی خۆی، کابرای پۆلیس دیل دەکات، سەربازەکان بە ئاگادێن. دەست بە تەقەکردن دەکەن، دەبێتە هەڵڵاو ئیدارە فرسەت دێنێت، دەچێتە سەربان و خۆی لە دیوارێکی بەرزەوە هەڵدەدات.. زامدار دەبێت، لەو نزیکە دارێکی بەرز دەبێت، دەچێتە سەر دارەکە و سەربازەکان گومانیان بۆ ئەو جێگایە ناچێت کە ئەوی لێ دەبێت.. تا دەوروبەر کپ و ئارام دەبێتەوە، دێتە خوارەوە و ڕێگایەك دەگرێت، ماوەیەك ڕێ دەکات، ڕێبوارێکی تووش دەبێت، لێی دەپرسێت: ((ئەم ڕێگایە بۆ کوێ دەڕوات؟)) ئەویش دەڵێت: ((بۆ ماردین دەڕوات..)).. ئەو ڕێگایە بەردەدات و دەکەوێتە سەر ڕێگای ((بن گول)).

یەتەرە: چەند ڕێ دەکات نازانم.. ماندوو دەبێت، لەبەر لاوازی و بێ توانایی دەکەوێت و دەبوورێتەوە.. بە ڕێکەوت سوارێك بەوێدا تێدەپەڕێت، کە بەو حاڵە دەیبینێت، ئاوی دەداتێ و سواری ئەسپەکەی دەکات و دەیباتە ماڵی خۆیان.. دوای پشوودان و هاتنە سەرخۆ، هەمدیس دەکەوێتە ڕێ، تا دەگاتە ڕووبارێك.. کام ڕووبارە نازانین.. ((موراد))ە، یان ((پەری))، یان ((موندور))ە.. یەکێك لەوانەیە.. جلەکانی دادەکەنێت و دەیەوێت بپەڕێتەوە، بەڵام ئاوەکە زۆر دەبێت، جلەکانی دەبات.. بە ڕووتی دەمێنێتەوە.. لەوێ لە لەمەکە چاڵێك هەڵدەکەنێت و دەچێتە ناو چاڵەکەوە.. لەو کاتەدا ژنێك لێی نزیك دەبێتەوە، ئیدارە ژنە لەم حاڵەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە، داوای هەندێك جلی لێدەکات لە ماڵەوە بۆی بهێنێت.. ژنە دەگەڕێتەوە ماڵێك و مێردەکەی تێدەگەیەنێت.. ئەوانیش جل و بەرگی بۆ دێنن.

ئیدارە ئاغا، جلەکان لەبەر دەکات و دەبێتە میوانیان خانەخوێکەی بە ژنەکەی دەڵێت، من دەچمە سەر کاروکاسبی، سەرمایەتی ئاگرێکی بۆ بکەرەوە.. ئافرەتەکە، ئاگری بۆ دەکاتەوە، نان و ماستی لەبەر دادەنێت.. دوای نان خواردن، هەر لە شوێنەکەی خۆی خەو دەیباتەوە.. ئێوارێ خاوەن ماڵ دەگەڕێتەوە، دەبینێت خەوتووە، دەپرسێت هێشتا لێرەیە؟ ژنە دەڵێت بەڵێ..

ئیدارە ئاغا، بە ئاگا دێتەوە و هەست دەکات توانای هەستان و ڕۆیشتنی نییە.. بە خاوەن ماڵەکە دەڵێت: ((برا، توانای ڕۆیشتنم نییە، ئەگەر ڕێگەم بدەیت ئەمشەویش لێرە دەمێنمەوە)). بەو جۆرە ئەو شەوەش دەمێنێتەوە.. ماڵەکە نەدارا دەبن، تا نوێنیان نابێت بۆی ڕاخەن. ئیدارە ئاغا هەست بەمە دەکات، دەڵێت پێویستیم بە نوێن نییە، هەر لێرەدا دەخەوم..

ئیدارە ئاغا، بە ئاگا دێتەوە، هەست دەکات توانای هەستان و ڕۆیشتنی نییە.. بە خاوەن ماڵەکە دەڵێت: ((برا، توانای ڕۆیشتنم نییە، ئەگەر ڕێگەم بدەیت ئەمشەویش لێرە دەمێنمەوە)). بەو جۆرە ئەو شەوەش دەمێنێتەوە.. ماڵەکە نەدارا دەبن، تا نوێنیان نابێت بۆی ڕاخەن. ئیدارە ئاغا هەست بەمە دەکات، دەڵێت پێویستیم بە نوێن نییە، هەر لێرەدا دەخەوم..

ئیدارە ئاغا، ژەنێکی لێهاتوو بووە.. سازێك بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، دایدەگرێت و تەماشا دەکات.. دواجار ڕوو لە خاوەن ماڵەکە دەکات، ڕێگام دەدەیت کەمێك ساز لێدەم؟ خاوەن ماڵ ڕازی دەبێت، ئیدارە دەست بە ساز ژەنین دەکات. خاوەن ماڵەکە دەڵێت: بیستوومە ئیدارەی برایم ئاغا هەڵاتووە و فیرارە، ئاخ ئەگەر دەستم دەکەوت...))

ئیدارە ئاغا دەڵێت: تۆ چۆن دەزانی هەڵاتووە؟

خاوەن ماڵەکە دەڵێت: خەڵکەکە وا دەڵێن، دواجار وتی خەونم بینیوە!

بێ گومان، هەواڵی هەڵاتنەکەی بڵاوببووەوە، بەهەر حاڵ بیستبووی، بەڵام دەڵێت خەونم بینیوە..!

ئیدارە ئاغا، دوای ئەمە، مەتەڵی ئاسنگەر و گورگی بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێت:

((ڕۆژێ لە ڕۆژان، گورگێك دەگرن، ئەوەی لەوێوە تێدەپەڕێت لێی دەدات.. یەکێك دەڵێت: بزنی خواردووم، یەکێك ئێژی مەڕەکەمی خواردووە، یەکێك وتی، مانگاکەمی خواردووە.. گورگەکە بە خۆی دەڵێت: ئەوانە کە لێم دەدەن یەکێك لەسەر بزنەکەی، یەکێك لەسەر مەڕەکەیەتی، یەکێك لەسەر مانگاکەیەتی، یەکێك لەسەر

مەرەکەیەتی، یەکێك لەسەر مانگاکەیەتی، دەردی ئەوانەم زانی.. باشە ئاسنگەر دەردی تۆ چییە پێم نالێیت؟ من چ زیانێکم بۆ تۆ بووە؟))

ئەی تۆ برا، ئیدارەی برایم ئاغا چ زیانێکی بەتۆ گەیاندووە چ خراپەیەکی بەرانبەر بەتۆ کردووە؟.

خاوەن ماڵەکە، ئاوا وەڵامی دەداتەوە: ((برا وەکو بیستوومە برایم ئاغا کابرایەکی زاڵمە، بەڵام بەرانبەر هەژار زوڵمی نەکردووە، لە بەرانبەر زاڵم زاڵمێتی دەکات.. من هیچ داوایەکم لەگەڵ ئەودا نییە، من دەمەوێ بڵێم و مەقسەدم ئەوەیە، ئیدارە ئاغا ببینم، عەشیرەتەکەی ئاگادار بکەمەوە و مزگێنیان لێوەرگرم، بەڵکو لەم هەژاری و نەدارییەم قورتار دەبم.. دەڵێن کورەکەی وتوویەتی: ((ئەوەی مژدەمان بداتێ پاداشتێکی گەورەی دەدەینێ..))

دەمادام وایە، من ئیدارەی برایم ئاغام..

دوای ئەوە ئاوی بۆ گەرم دەکەن، خۆی دەشوات، بۆ سبەینێ کابرا دەڕوات هەواڵی ئیدارە بە مزگێنی بە ماڵبادەکەی دەدات..

سەید خان: خانە خوێکەی، شوێنەکەی دیاری دەکات: ((ئێمە دەیهێنینە دێی ((سپی)) کە دەکەوێتە نێوان ((مامەکی)) و ((هۆزات)) تەنیا چیایەکیان لە نێواندایە و لە نزیکی ((پاقرگە)) دایە.

یەتەرە: قۆچانییەکان، کە هەواڵەکەیان پێدەگات ((سەمکانییەکان و ڕەسیکانەکان)) لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ((ئیسماعیلییەکان)) کۆدەکەنەوە و دەچنە پێشوازی.. نزیکەی ٢٠٠ کەسێك کۆدەبنەوە.. مزگێنیەکی باشیش دەدەنە کابرا..

ئیدارە ئاغا، بەر لەوەی زیندانی بکرێت، ٤ منداڵی دەبێت، سەید خان، یەتەرە، لیل، لێلە.

م. چ: ئەو دەمە ژنەکەی مابوو؟

- کاتێك لە بەندیخانە بوو ژنەکەی کۆچی دوایی کرد.

یەکێك لە پیاوەکانی، جارێکیان هەندێك جل و بەرگی لە بوخچەیەکدا بۆ دەباتە بەندیخانەکە.. ئیدارە، دەڕوانێتە بوخچەکە، لێی دەپرسێت، کە ئەم جل و بەرگانە لە بوخچەنرا ((زین)) لە ماڵ بوو.. کابرا دەڵێت، بەڵی لە ماڵ بوو..

کەو دەڵێ ئیدارە، هەناسەیەك هەڵدەکێشێ دەڵێ: ((بڕوا ناکەم)) زین مابێ.. کابرا ناچێتە ژێری و دەڵێ ماوە.. ئیدارە دەڵێ: ئەم بوخچە ڕێکخستنی زین نییە... باوکم پێدادەگرێ و مکوڕ دەبێ، ناچار کابرا دەچێتە ژێری دەڵێ: ((بەڵێ.. مرد..))

م. چ: کە باوکت لە زیندان بوو، دوای ئەو لە دێکەدا چی ڕووی دا، ئێوە چیتان کرد، با کەمێ باسی ئەمەش بکەین...

- باوکم، کە زیندانی کرا، لە دێکەماندا، یانی دێی ((ئاموتقە)) تازە قەرەقولیان دادەمەزراند، ((حسێن ئاغا)) بەڕێوەبەری شارەدێ بوو، مامەکانم لەگەڵ سەید خان و لیل منداڵبوون، سەربازەکان زۆر جەوریان لێدەکردین، بەتایبەتی خانەوادەکەی ئێمە.. بەڕێوەبەری ناحیەکەش باش نەبوو بۆ ئێمە. کوڕەکەی حسێن ئاغا، کە ناوی ((سەید ئاغا))یە، سواری ئەسپ دەبوو دەهات ئازاری ((لیل))ی دەدا، بە قامچی لێی دەدا.. پورم ((لەیلا)) تازە هەڵدەچوو.. ((حسێن ئاغا)) شەڕی پێدەفرۆشت، ((خەجە))ی خاڵۆزام، دەچووە لای ((حسێن ئاغا)) پێی دەگوت پیاوەکانمان دوور خراونەتەوە، ئەمجا نورەی ژنەکانە..

م. چ: سەربازەکان، کەی و بۆ لەوێ نەمان؟

- کە ئیدارە ئاغا گەڕایەوە، دەچێتە لایان دەڵێ: ئێوە من ناناسن، منیش ئێوە ناناسم، لێرە مەمێنن، بڕۆن. من هیچتان پێناڵێم، تەنیا دەڵێم بڕۆن و لێرە مەمێنن، ئێوە تا ئێستا زیانتان بۆمن نەبووە، بەڵام گەر نەڕۆن دەتانکوژم..))

بۆ بەیانییەکەی، باروبنەی خۆیان کۆدەکەنەوەو لە ((ئاموتقە)) نامێنن..

لە گوندی ((سینسۆرە)) زەینەب خاتوونێکی لێبوو، زۆر دەسترۆ و میوان دۆست بووە، ئەم ژنە خزمی نزیکی ((کوزیم ئۆغلو)) بوو، لەگەڵ ئیدارە ئاغادا نێوانیان کۆك بووە. ئیدارە زۆری ڕێز لێدەگرت.. ڕۆژێك دێتە ماڵی ئیدارە ئاغا و دەڵێ:

((داوات لێدەکەم لە کوزیم ئاغا خۆشبەو بی بەخشە و مەیکوژە..)) ئیدارە، قسەی زەینەب بە دوادا نادات و دەڵێت:

((باشە، با وابێ، بەڵام لەبەر چاوم نەمێنێ و دوور بکەوێتەوە)).

م. چ: بەڕاستی کوزیم ئۆغلو ناوی حەمەدە؟

- بەڵێ.. ((حەمەد))ە.. بەڵام لای خەڵکی بە کویزم ئۆغلو ناسراوە...

م. چ: دوای ئەوە؟

- کە باوکم وا دەڵێ، زەینەب دەڕوات بۆ کویزم ئۆغلوی دەگێڕێتەوە.. حاڵ و مەسەلە لەمە عیبارەت... ئیدارە ئاغا وا دەڵێ.. کویزم، دەڵێ، چی لەدەست دێ قسور نەکات.. ناڕۆم.

ڕۆژێك ئیدارە ئاغا، لەگەڵ چەند کەسێکدا بۆ سنسۆرە دەچن دەبنە میوانی ((زەینەب خاتوون)).. دوای نانخواردن، جارێکی کە مەسەلەی کویزم ئۆغلۆ دێتە ئاراوە.. زینەب دەڵێ: ((لە کویزم ئۆغلو، وازبێنە.)).. ئیدارە ئاغا، دەڵێ، تۆ تۆ وا دەڵێی و ئەویش لە مەیداندا دەخوێنێ..

بە سەید خانی کوڕی دەڵێ: ((یەك دوو کەس لەگەڵ خۆت ببەو، ئەو پیاوە بکوژە، با چاوم بە چارەی نەکەوێت..)).. دواتریش دەڵێ: ((دەست بۆ کەسی دیکە درێژ مەکەن لە کوێزم ئۆغلو بەولاوە. من ئازاری برا کوشتنم چەشت، با کەسی دیکە ئەو ئازارە نەچێژێ..)).

سەید خان و لیل و چەند کەسێکی کە، بەیانی زوو، بەرەو ماڵی کویزم ئۆغلو، دەڕۆن. کە دەیانبینێ هەڵدەستێتە سەر پا و پێشوازییان لێدەکات: ((فەرموون، سەید خان ئاغا)). وا دەڵێ، بەڵام، ئەوانی تر دەستی لێدەکەنەوە و بەر گوللەی دەدەن و دەیکوژن..

هەر کە کویزم دەکوژرێ، ئیدارە لەگەڵ پیاوەکانیدا، دەڕواتە دێکەی کویزم، تالانی دەکا و دەگەڕێتەوە.

یەتەرە: باوکم لەوێوە بۆ ((کاوڵگە)) دەڕوات. کە دێ حسێن ئاغایە، بە سواری ئەسپەکەی لەسەرەخۆ، دەڕواتە بەر دەرگای ماڵی حسێن ئاغا و دەنگی لێدەکات: ((ئەگەر مەردی وەرە بەر دەرگا..)) لەو کاتەدا ژنێك دەرگای لێدەکاتەوە و دەڵێ: ((حسێن ئاغا، یەك دوو رۆژە لە ماڵ نییە و سەفەری کردووە)).

باوکم بە ژنەکە دەڵێ: ((درۆ دەکەی.. کە کویزم ئۆغلو کوژرا ئەو لە ماڵەوە بوو..))

لەم کاتەدا، ژنێکی دیکە خۆی بەسەر سمی ئەسپەکەیدا دەدا، ئیدارە لە ئەسپەکەی دادەبەزێ: ((خوشکێ تۆ کێی؟)).

دەڵێ: ((من خێزانی کویزم ئۆغلوم)).

زۆر نابا، کوشتارەکەی ئەرمەنی دەستی پێدەکات، ژمارەیەکی زۆریان روو دەکەنە ئیدارە ئاغا، ئیدارە ئاغا، ئەوانە لای خۆی دەپارێزێ و تەسلیمی دەوڵەتیان ناکات.

دوای ماوەیەك لەسەر داوای خۆیان، دەیانەوێ بڕۆن، ئیدارە چەند چەکدارێکی خۆی لەگەڵیاندا دەنێرێ تا شوێنی مەبەست..

زۆر بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێناپەڕێ، ئەمجارە ((عەلی ئەلیشەری قوچگیری)) دێتە دەرسیم.. عەلیشەر، کابرایەکی سیاسی یوو، بۆ ئەم مەبەستە سەردانی ئاغاکانی ئەو ناوەی دەکرد، لە گەڵیاندا دەدوا.. بۆ لای ئیدارە هات و لەمبارەیەوە کەوتنە گفتوگۆ، تا ماوەیەکیش ((عەلیشەر)) لە-ئاموتقە- ماوەتەوە...

زۆر نابا مستەفا کەمال پەیدا بوو.. مستەفا کەماڵ، داوای ئیدارە و شێخ ڕەزا دەکات و بۆ ئەنقەرە بانگهێشتیان دەکات، داوایان لێدەکات، ببن بە نوێنەری عەشیرەتەکانیان.. ئەمانیش لە نێوان خۆیاندا و لەگەڵ ((عەلیشێر))دا لەو بارەوە دەدوێن و دەکۆڵنەوە.. ((عەلشێر)) دەڵێ: ((مستەفا کەمال، دەتانخەڵەتێنێ.. نەکەن ڕازی بن..))، بۆیە هەردووکیان داواکەی مستەفا کەمال بە دواوە دەدەن و نابن بە نوێنەر..

ئەمجارە، مستەفا کەمال، ((دیاب ئاغا و مچۆ)) ئاغا بۆ ئەنقەرە بانگ دەکات..
((عەلیشێر)) دەچێتە ماڵی ((دیاب ئاغا)) زۆری لەگەڵ هەوڵ دەدات ئەو داوایە قەبوولْ نەکات و نەڕوات.. بەڵام قانع نابێ، ((عەلیشێر)) وای دانابوو، گەر ((دیاب ئاغا)) نەڕوات، ئەوا ((مچو ئاغا))ش ناڕوات..، ((عەلیشێر)) ئەم باسە بۆ ئیدارە ئاغا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((ئەمە پیلانە، مستەفا کەمال کوردەکان هەڵدەخەڵەتێنێ، چەندم کۆشا لەگەڵ دیاب ئاغا، بێ سوود بوو، ئەو هەوڵەی لەگەڵ ئەومدا لەگەڵ بەرازێکدا بمدایە دەهاتە سەر ڕێ..))

ئیدارە ئاغا دەڵێ: ((مادام وایە، ڕێگای لێدەگرم و دەیکوژم..)).

عەلیشێر، بۆ ئەوەی ناکۆکی نەکەوێتە نێوان هۆزە کوردەکانەوە ڕێگای نادا..

ساڵی ١٩٢١ز، بزووتنەوەی ((قۆچگیری)) سەرهەڵدەدات، عەلیشێر دووبارە دێتە ((ئاموتقە)) و دەنێرێ پیاوە دیارەکانی دەرسیمیش بێن و داوای کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵدا دەکات بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی... بە سەید ڕەزا و محەمەد عەلی ئاغا و جەمشید ئاغا و چەند ئاغایەکی دیکە دەڵێ: ((ئەگەر ئێوە بێ دەنگ بن، ئەوەی لە قوچگیری دەستی حکوومەت کەوتوون دەیانکوژن... دەوڵەت ئیعدامیان دەکات، ئێوە خۆتان بە خاوەنیان بکەن و لەمبارەیەوە هیمەتێك بکەن..)).

((عەلیشێر)) لەوێدا نامەیەك ئامادە دەکات و بۆ دەوڵەتی دەنێرێ: {ئەگەر هەر شتێك بەسەر دیلەکان بێت، ئێمە بێ دەنگ نابین...} ئاغاکان نامەکە ئیمزا ناکەن، دەڵێن: ((ئەم نامەیە زۆر توندە، لەم کاتەدا دەوڵەت کە هێرش بۆ دەرسیم دەبات زۆرمان لەسەر دەکەوێت و لەژێری ناتوانین دەرچین..)).. بە ئیدارە ئاغاشی ڕادەگەیەنن.. ((تۆ ئێستا یاخیبووی، عەلی شێر و تۆ مۆری بکەن و بینێرن...)).

بەمجۆرە، عەلی شیر و ئیدارە ئاغا، نامەکە ئیمزا دەکەن و بۆ ئەنقەرەی دەنێرن.. بێ گومان دەرسیمییەکانیش لەمەدا بەشدار دەبن.. لە ئەنجامی ئەم هەوڵانەدا، حەیدەر بەگ و کۆمەڵێ دیلی دیکە ئازاد دەکرێن... بۆ ئەم هەوڵ و پشتگیرییەی ئیدارە ئاغا حەیدەر بەگ، ئەسپێك بە دیاری بۆ ئیدارە دەنێرێ و دەڵێ: ((چاکەت لە

گەڵماندا کردووە، بەڵام هیچمان بە دەستەوە نەماوە، تەنیا ئەم ئەسپەم هەیە و دەیکەمە دیاری بۆ تۆ..)).

دوای ئەمەش، عەلی شێر، زۆر هەوڵی ئاشتەوایی نێوان ئاغاکان دەدات، جارێکی کە کۆیان دەکاتەوە، تا کێشەکان چارەسەر بکەن، لە یەکێ لەو کۆبوونەوانەدا دەڵێ: ((دەبێ یەکگرین، پشتی یەکتر بەرنەدەین، ئەوکاتە دەوڵەت ناچار دەبێ مافەکانمان بدات.. وا نەکەین هیچمان بۆ ناکرێت..)).

دێیەك هەیە، ناوی ((باراسور))ە، دانیشتووانی ئەم گوندە، هەر لە زووەوە بۆ بازرگانی و کاروکاسبی دەڕۆنە ئەستەنبۆڵ، بەهۆی ئەوانەوە، ژمارەیەك زۆری چەك لە ئەستەنبۆڵەوە بە پاپۆڕ دەگاتە ((ترابزۆن))، لەوێشەوە بۆ ((ئەرزنجان)) و دەیگەیەننە دەرسیم و دەوروبەرەکەی.. {دەوڵەت ئێستا ناوی ئەو دێیەی گۆڕیوە و کردوویەتی بە ((باغلەر باشی Baglarbasi)) ئەم دێیە کەوتووەتە نێوان ((ئەرزنجان و دەرسیم)) و لە دۆڵی ئاوەڕەش ((Karasu)) دایە..

ئیدارە ئاغا، لەم کاتانەدا بە نەخۆشی کۆچی دوایی دەکات..

م. چ: نەخۆشییەکەی چی بوو؟

یەتەرە: نازانم بەچی نەخۆشییەك مرد، دەزانم نەخۆش کەوت.. بێ گومان نەمانتوانی بۆ لای دکتۆری ببەین، بمانبردبا، دەکەوتە بەر دەستی حکوومەت، یان دەیانکوشت، یان زیندانیان دەکرد، ناچار سەید خان و لیل بۆ ((هۆزات))ی دەبەن. لەوێ دکتۆرێك هەبوو، وابزانم دکتۆری عەسکەری دەبێ.. شەوێ دەچنە ماڵەکەی و بە زۆر دەیهێنن.. دوای پشکنینی دەڵێ ((نەخۆشییەکەی لە سییەکانیەتی، نەخۆشییەکەی گرانە.. زۆر نابا دەمرێت.)) هەرواش دەرچوو.. زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد..

عەشیرەتەکەی ئێمە لە دەوروبەری ((عەلی بوغاز)) نیشتەجێن. ساڵی ١٩٢٦ز لە دوای ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید، سوپای تورك هێرشێکی گەورەی بۆ ئەو ناوچانە ئەنجام دا، هەندێك لە هۆزەکانی دەرسیم و ئەلەزیز و دەوروبەری ((چەمیش گیزەك))

لەگەڵ تورکەکاندا چەکیان هەڵگرتبوو، یارمەتی تورکیان دەدا، قۆچانییەکان بەرگرییان دەکرد، هەروەها شەمککان و ڕەسکان و ئیسماعیلییەکان لەگەڵ ئێمەدا لە دژی تورکان دەجەنگان، ئەوانەی ناوم هێنان لە ڕاستیدا بەشێکن لە هۆزی ئێمە.. لە یەکەم ڕۆژی هێرشەکەیاندا ((مونزیر)) زامدار دەبێ، ((مزنزیر)) کوڕی مەحموود ئاغای برای ئیدارە ئاغایە.. کە پیاوێکی ئازاو جەسوور بوو.. پیاوی جوامێر و لێهاتوومان زۆر تێیدا بوو لەوانە: قوپوحسێن، لیلی مامەم، یووسفی مەمێ و زۆری دیکەش...

م. چ: مونزیر، لەکوێ زامدار بوو؟

یەتەرە: لە سەرووی ((زەنگی ڕاجی))یەوە زامدار بوو، زامەکەی کاری دەبێ، لەگەڵ (مووسا)ی برایدا لە سەنگەرێکدا بوون، خۆی چەکەکەی بەشاندا دەدات و دەیباتە دۆڵێکەوە ناوی ((دەرێ ژیارێ))یە تا دەیگەیەنێتە ((زوخور))، تورکەکان پێی دەڵێن ((زوگور Zugur)) تا دەگاتە ئێرەش هەر شەڕ دەکات، تاوێك شەڕی دەکرد تاوێك براکەی بە شاندا دەدا. لەبەر سەختی برینەکەی ((مونزیر)) لە ((عەلی بوغاز)) دەمرێت.. لەو شەڕەدا ((قمر عزیز))یش دەمرێت. ئەمەی دوایی، کابرایەکی سیاسی و ناودار بوو، کە سەربازەکان هەواڵی کوشتنەکەی دەزانن دەیکەنە ئاهەنگ..

لە شەڕی ١٩٢٦ز دا، هەندێك لە هۆزەکانی ((فاراتان)) و ((لاجینان)) و ((قەرەبالیان)) یارمەتی سەربازی تورکیان دەدا و رووبەڕووی ئێمە شەڕیان دەکرد))، لەبەر ئەوە قۆچانییەکان دێکانی خۆیانیان چۆڵکرد و ڕوویان کردە ((عەلی بوغاز)) لەوێ دەستیان کردە بەرەنگاری بوونەوەی سوپای تورك، سەربازەکانیش دێهاتەکانیان سووتاندین...

م. چ: لێرەدا دەمەوێ بپرسم: ساڵی ١٩٢٦ز بۆ سەربازانی تورك، هێرشیان کردە سەر قۆچانییەکان؟ لەوێ شتێ ڕووی دابوو؟...

- نەخێر، هیچی تازە ڕووی نەدابوو.. هەمووی کۆنە قین بوو.. سەربازەکان سێ چوار مانگ لە ناوچەکەی ئێمە مانەوە.. نەیانتوانی بچنە ((میخاری)).

م. چ: بیستوومە، ئەو هۆزانەی لەگەڵ تورکدا بوون لەژێرەوە دەستی یارمەتییان بۆ ئێوە درێژکردووە. ((بەیتار نوری))یش هەروا دەڵێ، لەم ڕووەوە چی دەزانیت؟

- هیچی وا لەو بارەوە نازانم.. بەڵام ((فەزلی)) ناوێك هەبووە ئەوە چەكی بۆ هۆزەكان پەیدا كردووە... دێی قۆچان، دەكەوێتە سەرووی ((چەمیش گیزەك))ەوە، گوندی ((چای باغی)) دەكەوێتە خۆرئاوایەوە، فەزلی لە كوردە سوونییەكان بوو.. بە سندوق چەك و فیشەكی لەوێوە دەهێنا.. ئەو چەكانەی لە كوێوە دەهێناو چۆنی پەیدا دەكرد ئاگادارنیم..

زستان هات.. زستانان سەربازەكان دەكشانەوە. ئەوانەی ئێمەش دەگەڕانەوە گوندەكانی خۆیان، هەرچەندە جاروبار دێهاتەكانیان تۆپ باران دەكرد، بەڵام پیاوەكان دێكانیان چۆڵ نەدەكرد...

لە دوای ئەو ڕووداوانە، ناكۆكی لە نێوان قۆچانییەكان و قەرەبالییەكاندا هەر بەردەوام بوو، ئێمە.. یانی قۆچانییەكان لەلایەكەوە خانوو وماڵەكانیان چاك دەكردەوە یان خانووی نوێیان دروست دەكرد، لەلایەكی ترەوە لەگەڵ ئەوانەدا بەشەڕ دەهاتن... ((عەلی شێر)) بۆ دامركاندنەوەی ئەو ئاگرە و تەبایی نێوانیان زۆر هەوڵی دەدا، وەلێ ئەنجامێكی وای نەدەبوو.. قۆچانییەكان، ئاشتییان قەبوڵ نەبوو.. بەڵام ((عەلی شێر)) سارد نەدەبووەوە، بەردەوام هەوڵی ئاشتبوونەوەیانی دەدا..

هەر بۆ ئەم مەبەستە، ((سەید ڕەزا)) زۆر هەوڵی دەدا، سەید توانی ئاشتیان بكاتەوە.. دیسان بەگەكان كۆبوونەوە و كێشەكە چارەسەركرا...

چەندین ساڵ بەم شێوەیە تێپەڕی، نێوانی دەرسیم و دەوڵەت هەر وەكو خۆی مایەوە.. هۆزەكان لەنێوان خۆیاندا بەردەوام لەم مەسەلەیە دەكۆڵینەوە.. عەلی شێر، زۆر هەوڵی دەدا تا یەك ڕیزی و تەبایی لەنێو دەرسیمییەكاندا بەرپا ببێ لەبەرانبەر حكوومەت تا توانی لە ((واجیغە)) كۆبوونەوەیەك بۆ خستنەڕووی داواكارییەكانیان.. بسازێنێت ئەوەی لەم كۆبوونەوەیەدا بەشدار بووبوو: سەید ڕەزا، سەید خانی مامەم، لە سەرۆكەكانی بەختیارییەكان یووسف ئاغا و جەمشید ئاغا، پیاوە دیارییەكانی

هۆزی بایتان و کاوانیش بەشدار بوو بوون.. لەوێ سوێند و پەیمان بۆ یەك دەخۆن و بەڵێن دەدەن پشتی یەکتر بگرن...

م. چ: ئەمە کەی بووە؟

- نازانم.. بەڵام دوای ساڵی ١٩٣٠ز بووە..

م. چ: ئەمەتان لەکێ و چۆن بیستووە؟.

- بە تەمەنەکانمان، هەمیشە باسی ئەمەیان بۆ کردووین، باوکم زۆر بە وردی بۆی گێڕاوینەتەوە.. بێ گومان عەلی شێر، ئەمەی زۆر بەلاوە مەبەست بووە، لەو کۆبوونەوەیەدا نامەیەکیش دەنووسن، ئاغاکان مۆری دەکەن، دواجار هەر ئاغایەك نوسخەیەکی دەدەنێ ((عەلی شێر))یش مۆری دەکات. ((بەیتار)) لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە دەبێت یان نا.. نازانم..

لە دوای ١٩٣٥ز، عەبدوڵڵا پاشا، کە دێتە ((ئەلازیز))، زۆر هامشۆی دێی ((ئاموتقە)) دەکات، پیاوە دیارەکانی هۆزەکەمان کۆدەکاتەوە، لەگەڵیاندا دەدوێ، مەبەست و نیازی (عەبدوڵڵا ئەلپ دوغان)) ئەوەبووە، ئێمە لە (سەید ڕەزا) دوور بخاتەوە.. عەبدوڵڵا پاشا، قەت ناوی سەید ڕەزای نەدەهێنا، هەمیشە بە ((ڕیشدارەکە)) ناوی دەبرد.. دەیگوت: ((لە ڕیشدارەکە دوور بکەونەوە، ڕیشدارەکە نەوتی بەخۆدا کردووە و ئاگری بەدەستەوەیە، خۆی خۆی دەسووتێنێت، کارێکی وا بکەن خۆتانی لێ دوور بخەنەوە. وابکەن ئێوەش لەگەڵ خۆیدا نەسووتێنێت...))

هەندێك کاری بۆ ((لیل))ی مامم دەستنیشان دەکرد.. وەکو دروستکردنی ((قشڵە)).. دەیویست ئێمە بێ دەنگ بکات.. لە دواییدا، دەوڵەت ئابڵوقەی دەرسیم دەدات و ساڵی ١٩٣٧ز دەست بە دەستدرێژییەکانی دەکات.. ئێمە ساڵی ١٩٣٧ز بەشداری شەڕەکەمان نەکرد.. بەڵام هۆزی ((بەختیاری)) کە نزیکمان بوون بەشداری شەڕەکەیان کرد.. سەید خان ئاغا دەیویست ((قەرەباڵیان)) و ((فەراتان)) بهێنێتە پاڵ خۆی ئەوجا بەشداری بکات، چونکە ئەوان بەشدار نەبن، بچنە پاڵ دەوڵەت، ئەوکاتە ئێمە تەنگاو دەبووین.. بۆ ئەوەی ئەو یەك دوو هۆزە، بێ دەنگ نەبن

((عەلی شێر)) هەوڵێکی زۆری دەدا.. ساڵ ١٩٣٧ز، سەربازی تورك لەلای ((پەرتەك))ەوە، هاتبووە کەناری ڕووباری فورات.. هۆزی ((پلیڤانگ)) بۆ ئەوەی ڕێگای پەڕینەوەیان لێ بگرێت، ڕێگای لێگرتبوون و کەوتبوونە شەڕ لەگەڵ سەربازەکاندا.. لەم کاتەدا ((عەلی شێر)) دەچێتە لای ئاغاکانی ((مەمەدالی)) و ((جەمشید)) پێی وتبوون:

((پلیڤانکەکان)) بە تەنیان، ناتوانن بەرگە بگرن، ئێوە یارمەتییان بدەن.. بەڵام ئەوان ڕازی نابن.. چونکی ئەو دوو هۆزە ((عەبدوڵڵا پاشا)) خەڵەتاندبوونی و هەرچی چەکیان هەبوو تەسلیمی دەوڵەتیان کردبوو.. ((عەلی شێر)) دەست بە گریان دەکات ((وای بەخۆم وای.. دەرسیم لەناو دەچێ.. دەرسیم یەك بوایەن کەس پێی نەدەوێران.. بەڵام کەوا نەبوو وا دەکەوینە ژێر پێی تورکان..)).

ساڵی ١٩٣٨ز، بارودۆخ خراپ و ئاڵۆز بوو.. سەید ڕەزا و هەندێ لە پیاوە ناودارەکانی دەرسیم هەڵواسران.. عەلی شێر، کوژرا.. زۆری دیکەش قەتلوعام کران.. لەو پیاوە ناودارانە کە ئیعدام کران بەتایبەتی لە بەختیارییەکان: شاهان ئاغا بوو.. دەرسیم کەوتە بارودۆخێکی خراپەوە، سەربازانی تورك کەوتبوونە گیانی دەرسیمییەکان.. هۆزەکەی ئێمە لە ((ئاموتقە)) خۆیان ئامادە کردبوو لەگەڵ قەرەقولەکاندا ڕووبەڕوو ببنەوە.. سەید خان، هێشتا لەناو قەرەباڵییەکان و فوراتییەکاندا نەگەڕابووەوە.. باوکم لەگەڵ کۆمیتەی قەرەقوڵی دێکەماندا نێوانیان ئاڵۆز بوو.. ڕۆژێك باوکم لەسەر دەمەقاڵەیەك گوللەیەك بە یەکێکیانەوە دەنێت، بەڵام ناپێکێت..

م. چ: باوکت لەوکاتەدا بە تەنیا دەبێت؟

- سەرەتا تەنیا دەبێت.. دواجار چەند کەسێك بە هانایەوە دەچن.

م. چ: باوکت، ئەو کاتە تەمەنی چەند بوو؟

- لە دەوروبەری بیستساڵیدا بووە..

م. چ: مادام وایە باوکت و سەید خانی مامت، بەری دایکێك نین..

- نەخێر.. باپیرم کە لە بەندیخانە هەڵدێت، دوای ئەوە ژنێکی دیکە دەخوازێت.. باوکم لە ژنی دووەمە..

م. چ: چۆن وا بە تەنیا ئەو قەرەقولە دەستگیر دەکات؟

- چەکی پێ بووە.. پێی وتوون ئەوەی بجووڵێت دەیکوژم.. ئیتر کەس بە جواب نەهاتووە..)) دواجار ((قوپو حسێن)) و ((یووسف ئاغا)) و چەند کەسێکی تر پەیدا دەبن، قەرەقولەکان چەك دەکەن و بۆ (هۆزات)یان دەنێرن.. باشچاوەشەکەش لای خۆیان وەکو دەستبەسەر دەهێڵنەوە..

م. چ: دواجار؟

- دەستبەجێ، لە هۆزاتەوە سەرباز دێ و شەڕ دەستپێدەکات. چەکدارەکانی ((قۆچان)) لووتکەی ((ساموشیە)) و ڕێگای ((کەرتێ تاناری)) دەگرن.. سەربازانی تورك ناتوانن بێنە پێشەوە.. لە سێیەم ڕۆژی شەڕەکەدا ((یووسف ئاغا))ی ڕەسکانلی زامدار دەبێت، هەر بەو زامەوە دەمرێت..

م. چ: یووسف ئاغا، لە نەوەی (مەمێ بالێ)یە؟

- بەڵێ.. لەلایەکەوە فەوجێك نزیك دەبێتەوە.. لەلایەکی ترەوە کتوپڕ دێی ((ئەدرگە)) کە دێی ((قوپو حسێن))ە، داگیر دەکەن و کوڕەکەی بەدیل دەگرن.. ئەدرگە لەو دیو ((عەلی بوغاز))ەوەیە و نزیکی ((چەمیش گێزەك))ە. کە ئەسیری دەکەن، لەگەڵ سەربازی دیلدا دەیگۆڕنەوە.. کە سەربازەکان ئابلۆقەی ((عەلی بوغاز)) دەدەن، چەکدارەکانی ئێمە ((پۆلی مەغارە)) داگیر دەکەن و دەستی بەسەردا دەگرن، تا پولی مەغارە، نەکەوێتە دەستی سسەربازەکانەوە، بۆیان ناکرێ بچنە ناو ((عەلی بوغاز)ەوە...

ئەو ڕۆژەی چەکدارەکانی ئێمە بۆ چاودێری ڕێگاکە دادەنرێن. کە دەبینن سەربازەکان دیارنین.. جێگاکانیان چۆڵ دەکەن و دەچن بەرخێك سەردەبڕن و دەست بە خواردن دەکەن.. سەربازەکان دەبینن ڕێگا چۆڵە، قولەکان کەسیان تێدا نییە، بە پەلە ((پولی ویرگی)) داگیر دەکەن و شوێنە بەرزاییەکان دەکەونە دەستی سەربازەکانەوە..

چەکدارەکانی ئێمە، خۆیان کۆ دەکەنەوە و ئابلۆقەی گرد و قولەکان دەدەن، بەڵام ناتوانن سەربازەکان لەو شوێنانە دەرکەن، ئەمەش مانای وایە بە ئاسانی ((عەلی بوغاز)) دەگرن.. ژن و منداڵ و پیر خۆیان لە ئەشکەوتەکاندا دەشارنەوە، چەکدارە کوردەکانیش، لە دەوروبەری ((عەلی بوغاز)) دەست بە شەڕکردن دەکەن.. سێ ڕۆژ لەوێ دەمێننەوە، دوای سێ ڕۆژەکە، سەید خانی مامەم و ئاغاکانی دیکە دەڵێن: ((دەبێ ئێرە بەجێ نەهێڵین، دێی مۆرو ((ماران)) بە دەستی سەربازەوەیە، ((ویرگی))یش بکەوێتە دەستیان، ئێمە ئەوکات ناتوانین لەم ناوانە خۆمان ڕاگرین، هەندێك ئەمەیان پێ باش دەبێ.. هەندێکیش ڕازی نابن..

((سەید حوسێن))ی موخوندو، لەگەڵ دەوڵەتدا نێوانی باش دەبێ.. لە هەمان کاتدا، لەگەڵ هەندێك لە خزمانیش مەرحەبای دەبێ.. لە ((مەغارا ویرگی)) بە تورکی پێی دەڵێن-Kurt Magarasi- چاوی بە ((سەید خان ئاغا))ی مامەم دەکەوێت، دەڵێت: ((خۆتان بەدەستەوە بدەن، حکوومەت هیچتان لێ ناکات!))

مامم دەڵێت: ((خۆمان بەدەستەوە بدەین قڕمان دەکەن..))

لەم بارەوە زۆر قسە دەکەن، مامم بە سەید حوسێن دەڵێت: ((سەربازی تورك بڕواتە ناو (بوغاز)ەوە هەموویان دەکوژێت، بۆ ئەم خەڵکە بە کوشت بدەین؟..))..

بەڵام ئەو مکوڕ دەبێت کە ((دەوڵەت لێیان خۆش دەبێت))..

دواجار، مامم لەگەڵ پیاوە دیارەکاندا ڕێك دەکەوێت ((مەغار))ە، بەجێبهێڵێت و دەڕوات بۆ ((تەخەر))، سەربازەکان ئەو دەوروبەرە دەگرن، چەکدارەکانمان بەدەم شەڕەوە پاشەکشێیان دەکرد کەوتبوونە بارودۆخێکی زۆر دژوار و سەخڵەتەوە.. کە دواجار باسکراوە.. چۆن هەندێك ڕای کردووە و خۆی رزگار کردووە، لە هەندێك شوێندا سەربازەکان هێرشیان بۆ خێزانەکان بردووە، هەندێك لەو خێزانانە منداڵی ساوای خۆیان بەجێهێشتووە، یان فڕێیان داوەتە ئاوەوە تادەستی سەربازی تورك نەکەوێت، یان لەبن تاوێرێکدا جێیان هێشتووە.. ئێمە خزمێکمان ژنەکەی ساوایەکی چلە دەرنەچووی فڕێ داوەتە ناو ئاوەوە.. ئەو منداڵە سەیر لەوەدایە ناوی ((قارەمان))

دەبێت.. ئافرەتێکی دیکەی دێکەمان ناوی ((بەسە)) دەبێت، ئەویش منداڵێکی خۆی لەژێر دار بەڕوویەکدا بەجێ هێشتووە.. کە ئێوارە چەکدارەکان دەگەڕێنەوە.. برایم (مێردی ژنەکە) دەڕوانێت، کوڕە بچووکەکەی دیار نییە.. دەپرسێت، ((بەسە)) بەدەم گریانەوە ئێژێ ((دامە دەستی دار بەڕوویەکەوە))! برایم، شێتگیر دەبێت، هەر ئەو شەوە، لەگەڵ چەند چەکدارێکدا بۆ ئەو شوێنە دەڕۆن، منداڵی ژێر دار بەڕووەکە بە سەلامەتی دێننەوە... بۆ سبەینێ ((قارەمان))یش لە دێیەکی نزیك لاشەکەی لە ئاوەکەدا دەدۆزنەوە.

م. چ: بۆ منداڵەکانیان بەجێ دەهێشت، یان فڕێیان دەدایە ناو ئاوەوە؟

- لەو باوەڕەدا بوون، کاتێك ڕاویان دەنان.. کەسیان قورتار نابێت، یان بامرن، بەڵام بە سونگی و نێزە بەبەر چاوی دایکەکانیانەوە نەکوژرێن.. دواجار، ئەو شوێنەی لێی دەبن، سەغڵەت بوون تێدا، ناچار بە دۆڵەکەدا دەڕۆن تا دەگەنە ((داش بامیە)) کە نزیکی ((تانزیگە)) لەوێش سەربازەکان ئابڵۆقەیان دەدەن، چەکدارەکانمان دەکەونە شەڕی مان و نەمان.. شەڕێکی سەخت لەوێدا دەقەومێت، گردێکی بەرز لەوێ دەبێت، ڕەشاشێك لەوێوە ناهێڵێت بجوولێنەوە. باوکم بەپێ دزە، لە پشتەوە سەردەکەوێتە سەر گردەکە، تا بە تەواوی لە ڕەشاش بەدەستەکە نزیك دەبێتەوە، تەنیا ٤٠-٥٠ مەترێك دەمێنێت پێی بگات، لەوێوە تەقە لە کابرا دەکات و دەیکوژێت، بەو شیوەیە ڕزگاریان دەبێت.. ئەوەی مابووەوە دەڕۆن بۆ ((واچیغە)).. لە نێوانی واچیغ و پلانموردا ئاواییەك هەیە پێی دەڵێن ((بۆدگ))، دەچنە ئەو گوندە.. ((قوپو حسێن)) خۆ بەدەستەوە نادات، ڕوو دەکاتە چیاکان و لەوێ دەمێنێتەوە.. مامی باوکم هەر لە دێی ((ئاموتقە)) لەگەڵ چەند چەکدارێکدا دەمێننەوە، چەند جارێك دەچنە سەریان ژنەکەی ((کاوانی)) بوو.. خۆیان ناگرن لە ئاموتقە، دەچنە دێی کەسوکاری ژنەکەی.. لە ڕێگا دێیەکی ڕووخاو دەبێ بۆ پشوودان لادەدەن، تومەز سەربازی لێیە، دەستڕێژی لێدەکەن و لەوێ دەمرێت. خزمەکانی لاشەکەی بۆ دێی ((گانگراس)) دەبەن.. لەو دێیە دەیبەنە ماڵی خدری جافەر،.. لەولاشەوە، ئەوانەی

ئێمە لە ئەشکەوتەکەی ((عەلی بوغاز)) خۆیان ناگرن، دەردەچن، زۆری پێناچێ سەربازەکان دەگەنە شوێنەکانیان، ئەگەر دەرنەچووبایەن لەوێ هەموویانیان دەکوشت... ئەوەی ئەو ڕۆژگارەی بینیوە دەڵێت: لاشە کۆمەڵ کرابوو، ئەشکەوت و دۆڵەکان لاشەی پیر و گەنج و ژن و منداڵیان تێدا کەوتبوو...

دوای تەواو بوونی ڕاپەڕینەکە، ئەوەیان بگردایە وەکو سەرەتای ڕاپەڕینەکە نەیاندەکوشتن ((تەرحیل))یان دەکردن.. بۆ شوێنە دوورەکانیان دەناردن.. بێ گومان ئەوانیش سەغڵەتی و ئازار و نەبوونیان زۆر دەچەشت.. پیاوانی بە تەمەن باسی ئەو دەمانە زۆر بە ناخۆشی دەگێڕنەوە...

م. چ: نموونەیەك لەو ناخۆشییانەمان بۆ باس ناکەیت؟

- ڕۆژێکیان.. ژمارەیەکی زۆر دیلیان بۆ عەلی بوغاز بردووە.. منداڵ و ژنیان لەگەڵدا بووە.. لەناو دیلەکاندا دوو ژنی یەکجار نازدار و جوانیان تێدا دەبن.. چەند چەکدارێکی کورد لەناو لەشکری تورکدا دەبن {جاش بوونە-ئەحمەد-}.. دەستدرێژی دەکەنە سەر ئەو دوو ژنە.. ((یوزباشی))یە تورکەکە لەوە ئاگادار دەکەنەوە بانگیان دەکاتە بەردەم سەربازەکان و هەردووکیان بە دەمانچەکەی دەکوژێت..

م. چ: مامەت و باوکت، تاکەی لە ((بودیك)) مانەوە؟.

- ساڵی ١٩٣٩ز، لە مانگی شوبات، ژن و منداڵەکان، لە ((بودیك)) دادەنا و خۆی و چەند کەسێکی تر بۆ ((عەلی بوغاز)) دەڕۆن..

م. چ: بۆ؟

- تاکو بارودۆخی ئەوێ بزانن، نیازیان بووە لەوێ جێگیر بن..

م. چ: باشە، لەوێ سەربازی تورك نەبوون؟

- زستان هات سەربازەکان کشانەوە.. دەیانەویست لە ڕێ و شوێنی خۆیان بمێننەوە..

یەتەرە: کە ((بودیك)) بەجێ دەهێڵن و بڕیاری ڕۆیشتن دەدەن، دانیشتووانی گوندەکە پێشیان لێدەگرن و حەز ناکەن بڕۆن، دەڵێن: ((مەڕۆن.. بۆ دەڕۆن،

سەربازەکان دەتانبینن دەتانکوژن))... هەرچەند دەکەن سوودی نابێت، دەکەونەڕێ بەفر هەموو لایەکی داپۆشیبوو، باهۆز بوو، بەو جۆرە دەگەنە شوێنی خۆیان، ماوەیەك دەمێننەوە خۆیان تەسلیم دەکەن.. ئەو دەمە، ئەوەی خۆی تەسلیم دەکرد نەیاندەکوشت.. ((تەرحیل))یان دەکرد.. سەربازەکان هاتن و بردنیان، ئەوەی نەیدەتوانی ڕێ بکات ((دارەبازە))یان بۆ دەکرد و بە دوو کەس هەڵیاندەگرتن.. زۆربەیان بەفر پێی بردبوون.. سەید خانی مامم گۆرەوی خوریی لەپێ دەبێت، پاکانی بەفر نایانبات، بەڵام باوکم و لیلی مامم بەفر پێیانی سووتاندبوو.. لەبەر ئەوە ماوەیەك دەیانهێڵنەوە دواتر دەیانبەن.. سەید خانی مام و باوکم و ڕەزای مورسایی، بۆ ((بولو Bulu))-تەرحیلیان- دەکەن، بەڵام پێکەوەیان دانانێن، هەریەکە و لە شوێنێك دەبن.. باوکم دەبەنە دێی ((کوینوك Goynuk))، ئیبراهیم مورسایی دەبەنە ((سۆما))ی سەروو، لیلی مامم بۆ ((ئینەگول inegol)) دەبەن..

قوپو حسێن، لەو غەریبیە هەڵناکات، ماوەیەك دەمێنێتەوە دواجار بە دزییەوە بۆ دەرسیم دەگەڕێتەوە..

م. چ: بۆ؟

- هەڵناکات، ناتوانێ لەوێدا بژی، وتبووی لەجیاتی ئەوەی لە غەریبایەتی بژیم، دەڕۆین لە چیاکانی لای خۆمان بە قاچاغیش بمێنینەوە لەمە باشترە..

م. چ: چۆن توانی لەوێ بمێنێتەوە؟.

سەید خان: ئەوەی ڕاستی بێ، دەڕواتە ((عەلی بوغاز))، لەوێ لە ئەشکەوتەکاندا دەژیا، بەڵام زۆر نابات سەربازەکان پێی دەزانن، دەڕۆن ئابلۆقەی دەدەن.

م. چ: دەوڵەت چۆن زانی ئەو لەوێیە؟

- کابرایەك خەتەنەی دەکرد.. ناوی خدر دەبێ، پێیان دەگوت، خدێی عەلی.. ((قوپو)) چەند جارێك دەچێتە ماڵیان، ئەو پیاوەش خەبەری دابوو.. بەر لە گرتنیان کابرای خەتەنەچی، دەچێتەی لای ((قوپو))، لەوکاتەدا ((حوسێنی)) برازای لەوێ

دەبێت، دەڵێت: مامە، ئەم کابرایەم باش نایەتە بەرچاو من وای بۆ دەچم خەبەرمان لێبدات، بالێرە بیکوژم..))

((قوپو)) دەڵێت: ((ئەم پیاوە خەتەنە دەکات، کاری وای لە دەست نایەت..))

برازاکەی پیاوێکی ژیر دەبێت، مکوڕ دەبێت ((ئەمجارە دەڕواو خەبەرمان لیّ دەدات.. ڕاوەستە با بیکوژم..))

((قوپو)) لێی تووڕە دەبێت ((کاری وا نابیّ بکرێت...))

((خدۆ)) هەر لەویّ دەردەچێت، یەکڕاست خۆی بە سەربازە تورکەکان دەگەیەنێت و خەبەریان پیّ دەدات.. شەبەق دەوروبەری ئەشکەوتەکە دەگرن. ئەویش لەناو ئەشکەوتەکەدا دەبێت {تا ئێستا ئەو ئەشکەوتە بەناوی ئەوە ماوەتەوە (( Qopo Magarasi)) ئەشکەوتی قوپو... کە سەربازەکان منداڵەکان دەبینن، لە ئەشکەوتەکەوە دەردەچن و ڕادەکەن، دەچێتە سەر گردێك.. ژنەکەی زامدار دەکەن.. هاوار دەکات جێم نەهێڵن زامدارم.. قوپۆ دەگەڕێتەوە، خۆی پێدەگەیەنێت و دەستی دەگرێت، زۆر نارۆن خۆشی زامدار دەکەن، سەربازەکان کچەکان دەکوژن، بەڵام کوڕەکەی و برازاکەی ڕۆژێك دواتر دەیانگرن، کوڕەکەی ناوی ((زایت)) دەبێت، ئێستاش ماوەو لە ژیاندایە ((زابت)) و ((حوسێن)) بۆ ((چەمیش گێزەك)) دەبەن.. برازاکەی لە ئەفسەرەکە دەپاڕێتەوە یەك دوو ڕۆژ مۆڵەتی بدەن، دەڵێت دەڕۆم لاشەکەی مامم دەنێژم..، دەڵێت دوای ئەمە بۆ کوێم دەنێرن دەڕۆم...

ئەفسەرەکان پێی دەڵێن: چیت دەوێت لە لاشەی مامت هەقت نەبێت.. حوسێن، دەڵێت ((دەمەویّ بینێژم..)).. زۆریان لەگەڵدا هەولّ دەدات.. لە دواییدا دەڵێن: باشە یەك دوو سەربازت لەگەڵدا دەنێرین بڕۆن لاشەکەی بنێژن و وەرنەوە..

بەڵام سەربازەکان، بەرەو ((چەمیش گێزەك)) دەیبەن، لەویّ لە دۆڵێکدا دەیکوژن و خۆیان دەگەڕێنەوە.

کوڕەکەی ((قوپۆ))، تەرحیل دەکەن، لەلایەکی ترەوە بۆ سووکایەتی پێکردن، سەری بڕاوی قوپۆ و ژنەکەی و کچەکانی بۆ ((چەمیش گێزەك)) دەهێنن و لە

مەیدانێکدا ئەو ((سەرانە)) دادەنێن تا خەڵکی بیانبینێت و چاویان پێ بشکێت... سێ ڕۆژ ئەو (سەرانە) لەو ناوە دەهێڵنەوە...

م. چ: قوپۆ، چەند کچی هەبوو؟

- وابزانم چوار...

م. چ: هەموویانیان کوشت؟!

- بەڵێ...

یەتەرە: ژنێك هەبوو، ناوی ((کەو)) بوو، ئەو دەیگێڕایەوە: ((...دەمەو عەسرانێك، هەندێکیان هاتنە ماڵی ئێمە، من نانم دەکرد، هەندێك (جەواڵیان) لەبن دیوارەکە دانا، خوێنی لێ دەچۆڕا.. بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن و پێی بزانن، چووین دەمی جەواڵەکانمان کردەوە، پڕی بوو لە سەری بڕاوە..!! سەری قوپۆ و ژنەکەی و کچەکانی لەناو جەواڵێکدا بوون، کچەکان کەزی و قژە درێژەکانیان ئاڵۆسکابوو... خوێناوی ببوون.. کە ئەوەمان بینی، خۆمان پێڕانەگیرا و دەستمان بەشیوەن کرد.. سەری قوپۆ و خێزنەکەیان بڕی بوو و هاتبوون لە ماڵی ئێمەدا خزمەتیان بکەین و نان بخۆن!!... ئێمە، لەو شیوەن و زارییەدا بووین، سەربازەکان هاتن، دەستیان بە قسەی ناشیرین کرد.. سەری جەواڵەکانیان دووبارە گرێ دایەوە...

عەبدوڵڵا پاشا، ساڵی ١٩٤٥- ١٩٥٠ز نوێنەری ((پولو)) بوو، پێشتر باسی ئەوەم کرد کە سەید خانی مامم و باوکم لە ((پولو)) بەزۆر دایان نابوون.. جا، هەر ئەو کاتەی ((قوپۆ و ژنەکەی)) سەردەبڕن مامم و باوکم لەوێ دەبن، عەبدوڵڵا پاشاش ئەو ڕۆژگارە لەوێ دەبێ، مامم و باوکم دەعواتی نانخواردن دەکات.. دەست بە قسە و باس دەکەن، زۆربەی قسەکانیان دەربارەی ((سەید ڕەزا)) دەبێت، لەم کاتەدا، سینییەك دێنن و کەللە سەرێکی لەسەر دانراوە.. لە مامم دەپرسێت: ((بڕوانە.. بزانم دەزانیت ئەم کەللە سەرە، کەللە سەری کێیە؟ دەیناسیت؟!)).

مامم تەماشای دەکات و دەڵێت: ((ئەمە سەری قۆپۆ))یە.. عەبدوڵێ پاشا دەڵێت: وایە.. ئەمە سەری ئەوە...

دوای ئەوە، قسە و باس دێتە سەر شەڕەکەی دەرسیم، مامم بەردەوام ((رایوەر قوپ)) گوناهبار دەکات: ((ڕاستە سەید ڕەزا بەرانبەر دەوڵەت ڕاوەستاو یاخی بوو، شەڕی کرد، هێرشی دەبردە سەر قەرەقولەکان، بەڵام کە قەرەقولێکی، جەندرمەیەکی دەستگیر دەکرد، چی دەکرد؟.. خزمەتی دەکردن، نەیدەکوشتن.. (رایوەر قۆپ)یش پیاوێکی دوو ڕوو بوو، بەردەوام خەریکی ئاژاوە و دووبەرەکی نانەوە بوو...))

عەبدوڵڵا پاشا دەڵی: بەرانبەر بە ((قوپ)) هیچ خراپەم نەکردووە و نەچوومەتە گوناحی.. ئەو مرد و ڕزگاری بوو...))

((رایوەر قوپ)) خزمەتی دەوڵەتی زۆر کرد، زۆر خراپەی بەرانبەر بە دەرسیم کرد.. کەچی دەوڵەت ئاوا جەزای دایەوە.. عەبدوڵڵا ئەلپ دوغان، لەبارەی ئەوەوە دەڵێت: ((چاکەی بۆ میللەتەکەی خۆی نەبوو دەبێت چۆن بتوانێت خزمەتی دەوڵەت بکات؟ سبەی لە ڕووسیاش، یان هەر دەوڵەتێکی دیکە پارە وەردەگرێت و خزمەتی ئەو دەوڵەتە دەکات..)).

لەمەو پێش باسم کردبوو کە ((لیل))ی مامەم، بۆ ((ئینەگول)) تەرحیل کرا بوو.. دەوڵەت پارچەیەك زەوی لەوێدا پێی دابوو، دوای ماوەیەك هەندێك لە دانیشتووانی دێکە ناڕازی دەبن کە زەوی لە دێکە پێ دراوە.. پێی دەڵێن: ((ئەم زەوییە هی ئێمەیە، با دەوڵەت پارچە زەوییەکی دیکەت بداتێ..))

مامم ڕازی نابێت، نێوانیان تێکدەچێت.. تەماشا دەکات بارودۆخەکە خراپتر دەبێت و نیازی کوشتنی دەکەن، ناچار لەوێ نامێنێت، دەچێتە ((مەرکەزی ئینەکول)) و زەوییەکەشی لەدەست دەردەکەن..

قائیمقامەکەی کاتی خۆی، لە ((هۆزات)) قائیمقام دەبێت، دەبینێت غەدری لێدەکەن، بانگیان دەکات دەڵێت: ((حەقتان بەسەر ئەم پیاوەوە نەبێت.. لەبەر چاوی ئێوە غەریبێکە، بەڵام دەبێت بزانن، سەردەمانێك کاتێك دەهاتنە لام، ڕاستە پا لەبەریان هەڵدەستاین و پێشوازیمان لێدەکردن...)).

باوکم بە ((تەرحیل)) کردنەکەی زۆر سەغڵەت دەبێت، لەگەڵ دانیشتووانی ئەو دێیەدا ناخۆشی دەکەوێتە نێوانیانەوە... ساڵی ١٩٤٩ز باوکم گەڕایەوە زێدی خۆی...

ساڵی ١٩٣٩ز، کاتێ سەید خانی مامم و لیل و باوکم لە نەخۆشخانەی ((ئالای)) دەبن، دکتۆرەکان چارەی پاوپلیان دەکەن کە بەفر برودبوونی.. یەکێك لە دکتۆرەکان زۆر یارمەتی باوکم دەدات.. ناوی {جەمالەدین جان} دەبێت-ڕەنگە جان نەبێت (جام) بووبێت...

م.چ- ئەو دکتۆرە لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەدا (کە پیاوی دەوڵەت دەبن) وێنەیەك دەگرن.. لە دوای ئەوە، دوای ساڵانێکی زۆر، باوکم زامێك لە قاچی پەیدا دەبێت.. زامەکەی درێژە دەکێشێت، ساڵی ١٩٧٠ز، لە نەخۆشخانەی ئیسپارتەی ئێسك قاچێکی دەبڕنەوە، تا تووشی گەنگەری نەبێت.. دوای ئەوەش دەچێتە نەخۆشخانەی ((حاجی تەپە))، ئەو دکتۆرەی چارەسەری دەکرد، لێی دەپرسێت: تۆ کێت؟ خەڵکی کوێت؟ باوکم گومان دەکاتو ڕاستی خۆی و جێگای پێ ناڵێت. ئەمجا دکتۆر پرسیاری کوڕەکانی ئیدارە ئاغای لێدەکات.. دکتۆر زۆر چاك دەیزانی کێیە و کێ نییە.. لە دواییدا دکتۆرەکە ئەو وێنەیە دێنێت کە کاتی خۆی گرتبوویان. ئەمجارە لە باوکم دەپرسێت، ڕاستی خۆی پێ دەڵێت {بەڵێ من کوڕی ئیدارە ئاغام}.

((ئەو وێنەیەیە کە لەسەر بەرگی یەکەمی دەقە تورکییەکەیە-ئەحمەد-)).

## سەربازێکمان ببینایە دڵمان دادەخورپا

م. چ: ناوت چییە؟

- ناوم ((بێزا خدێ ئاوزەتی))یە.

م. چ: ساڵی ١٩٣٨ز، گەلێ ڕووداوی گرنگ لە دەرسیم ڕوویان دا، قەتلوعام کران، تۆ چی دەزانیت و چیت بینی؟.

بێزا: چیمان نەدی؟ ئەوەی ئێمە بینیمان، ئەوەی بەسەر ئێمە هات کەس نەیبینێت و بەسەری کەس نەیەت... چیمان نەدی..؟

م. چ: وەکو چی؟

- بەر لە ساڵی ١٩٣٨ز، گەلێك ڕووداو ڕوویان دا، ئەوەی ڕۆیی ڕۆیی، ساڵی ١٩٣٨ز لە مانگی ئابدا، خەریکی کشتوکاڵی خۆمان بووین، لەناو مەزراکانی خۆماندا بووین.. دروێنەمان دەکرد کاتێك سەربازەکان هاتن.. زۆر ترساین..

م. چ: لەچی ترسان؟

- لە ڕاست و چەپەوە، هەواڵ و دەنگ و باسی ناخۆشمان دەبیست، ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ئەو سەربازانە جێگای گومان و ترس بوون.. دەرسیمییەکان کەوتنە مقۆمقۆ.. تا ئاخیرییەکەی ڕۆژێکیان هێشتا دنیا ڕووناك نەبووەوە، سەربازی تورك ڕژانە ئەو دەورووبەرەوە. لەهەر چوار لاوە هەر سەرباز دەهاتن، لەولاشەوە زیل و تانك، نەماندەزانی بۆ کوێ دەچن.. ئەو ڕۆژە پەیتا پەیتا تا ئێوارەکەی هەر هێز و سەرباز تێدەپەڕی..

م. چ: کە ئەو هەموو هێزەتان بینی چیتان کرد؟

- هیچمان نەکرد.. ترساین.. زۆر ترساین..

م. چ: دواجار چی ڕووی دا؟

- لەولای دێکەمانەوە، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((سانیگا))، هەندێك لە سەربازەکان هاتنە ئەوێ، چادریان هەڵدا... ((سانیگا)) ڕاستییە و چیمەندارە، ئەو ناوە لەوەڕگەو مەزرایە، بەهاران هەندێك لە ئاغاکان لەوێدا چادر هەڵدەدەن و چەند ڕۆژێك دەمێننەوە.. هەر لەو نزیکە شوێنك هەیە پێی دەڵێن ((کلیسە))، جەمشید ئاغا هەمیشە ئا لەوێدا چادری هەڵدەدا.. سەربازەکان، کە دێنە ئەوێندەرێ، فەرمان دەدەن، ئەوەی لەم ناوانەدا چادری هەڵداوە با لێرە نەمێنێت و بڕواتە دێکەی خۆی..

م. چ: چادرەکان هی دەرسیمییەکان بوون؟

- بەڵێ..

م. چ: کێ فەرمانی لابردنی چادرەکانی دا و چییان گوت؟

- یەکێك هەبوو، ناوی ((حوسێنی باش چاوش)) بوو، ئەو هات و وای گوت.. ئەو باش چاوشە لە ((خوزات)) دادەنیشت Hozat؟ وتی: ((پاشا هاتووە، دەبێت هەمووتان چادرەکانتان هەڵگرن و بگەڕێنەوە دێکانی خۆتان..)) پرسیان لەبەرچی؟ وتبووی: ((سوپا-موناوەرە- دەکات..)) وا وەڵامی خەڵکەکەی دابووەوە.. بەهۆی ئەم هەواڵەوە، لە ((قەرەباڵییەکان)) مەمەدالی ئاغا و وەیسی کوڕی، چوونە لای پاشا.. لەو کاتەدا ((ژنەکەی)) کێکی ئاغا، لەگەڵ چەند کەسێکدا چووبوونە ((خۆزات)) بۆ بینینی پاشا و یوزباشی..

م. چ: ئەو خانمە ((خانمی کاکێ ئاغا)) دەیویست چییان پێ بڵێت؟.

- ئەو لە ((سمیلکە)) دادەنیشت، وتبووی: ((دێکەی من گەرمە، ئاژەڵەکانمان، منداڵەکانمان بەرگەی گەرماکە ناگرن، دەمەوێت لە (قورقولیگ) بمێنمەوە..))

چاوی بە پاشا نەکەوتبوو، ئاوای بە سەربازەکان گوتبوو.. داواکەیان قەبووڵ کردبوو و بەوە ڕازی ببوون چادرەکەی هەڵنەگرێت.. لەوکاتەدا ((خانم))مان بینی بەرەو لای باپیرم دەهات..

م. چ: باپیرت ناوی چی بوو؟

- خدریێ ئاوزاتی.

م. چ: باشە، دواتر؟

- باپیرم، چووە پێشەوە و لێی پرسی ((دەنگ و باس چییە؟)) ئەم هەموو سەربازانە بۆچی لێرەن؟.

خانم وتی: مەپرسە.. هاتوون بمانکوژن..

ئاوا وەڵامی باپیرمی دایەوە... باپیرم لێی پرسی: ((چییان گوت))؟، خاتوون وتی: ((پاشا کەس نابینێت، ئەفسەرەکان وتیان، ئێستا برۆن، سبەی وەرنەوە.. پاشا دەیەوێت بتانبینێت..

سەرۆکی ((قەرەیالێیەکان)) ناوی ((مەمەدالی ئاغا)) بوو، پیاوێکی داناو ژیر بووە.. ئەو ڕۆژە لە ((خۆزات)) دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ژنەکەیدا دەڕواتە شوێنێکی نزیکی دیکەی ((جەمشید ئاغا)).. دەیەوێت چاوی بە جەمشید بکەوێت، جەمشید ئاغا، خۆی و ژنەکەی دەڕۆنە ئەو جێگایەی بۆیی دیاری کردبوون. مەمەدالی ئاغا، بە جەمشید دەڵێت:

((جەمشید ئەمانە بۆ کوشتنی ئێمە هاتوون، بادەرچین و لە دێکاندا نەمێنین، مەبەستیان من و تۆیە، ئێمە بڕۆین هیچ لە گوندییان ناکەن..)).

م. چ: جەمشید چی گوت؟

- نازانم.. چی وەڵام دابووەوە، بەڵام دواجار ژنەکەی جەمشید ئاغا گێڕابوویەوە: ((..نازانم مەمەدالی ئاغا بیری بۆچی ڕۆیشتبوو، لەبەرچی و بۆچی دێکەمان بەجێ بهێڵین و بڕۆین؟!، کەوامان کرد، منداڵمان.. ماڵ و سەروەتمان دەکەونە ژێر پێوە و لە دەستمان دەردەچن.. زۆر زۆر ((تەرحیل))مان دەکەن لەوە زیاتر هەیە... چیمان کردووە، بۆ ڕابکەین؟)). جەمشید ئاغا، دێکەی بەجێ ناهێڵێن و ناڕوات..

بێژە: بۆ بەیانییەکەی، کە ڕۆژ بووەوە، هەستام مەشکە بژەنم. کە لە خەو هەستام، باوکی منداڵەکانیشم بە ئاگاهێنا، تاکو قازانە ماستەکەم لەگەڵدا هەڵگرێت و یارمەتیم بدات، کاتێك ماستەکەم لە مەشکەکە کرد، گوێم لە دەنگی پێی وڵاخی

بەرزە بوو، ڕوانیم وا سەربازەکان ئابلۆقەی ماڵی ((خاتوون))یان داوە، ئەو ناوە سوارەی چەکداری لێیە.. لە خوار ماڵی ئێمەوە، دۆڵێك هەیە، کۆمەڵێك سواری دیکە بەرەو ئەو دۆڵە دەچوون، کە بینیمن گەڕامەوە ماڵێ، وتم: ((چەند سوارێك چوونە دۆڵەکەوە، ماڵی ((خاتوون))یش لەلایەن سەربازەکانەوە ئابلۆقە درابوو.

کە وام گوت پیاوەکەم وتی: ((وەرە ژوورەوە و دەرگاکە داخە))..

دەرگاکەم کلۆم دا، لە کونی دەرگاکەوە جەندرمەکانم بینی، جەندرمەکانی دێکەمان بوون دەمناسین، یەکێکیان ناوی ((ئەردەم)) بوو، لەگەڵ خاتوون))دا وەکو خوشك و برا وابوون، هەمیشە لە ماڵی خاتوون نانی دەخوارد و خزمەتیان دەکرد.. لەم کاتەدا ((ئەردەم)) بانگی کرد:

- موختار، موختار...

باوکی منداڵان وەڵامی دایەوە

- فەرموو ئەردەم، چیت دەوێت؟

- تۆ جارێك وەرە دەرەوە...

- شتێکت هەیە بیڵێ.. یان دەتەوێت بێمە دەرەوە.. ئەگەر کارێکت هەیە با خۆم لەبەر بکەم..

- خۆت لەبەرکە و وەرە.. بۆ شوێنێکی نزیك دەڕۆین.. ((حەسەن ئۆنباشی)) تۆی گەرەکە..

((حەسەن ئۆنباشی)) قەرەقوڵی کاتی دێکە بوو..

قوموتانەکەش ((عومەر ئۆنباشی)) بوو..

باوکی منداڵەکان ئەمجارە وتی:

- دەمانکوژن؟

من پێم گوت: تکایە، قسە نەکەی، دەنگت نەیەت، هەرچی بکەن دەیکەن.)).

ئەو دەمە، دووگیان بووم.. مێردەکەم چووە دەرەوە، لە دوایەوە چوومە دەرەوە، تا بزانم بۆ کوێی دەبەن و مەسەلە چییە.. لەگەڵ سەربازەکاندا، بەرەو چادرەکەی خاتوون دەچوون.. لەم کاتەدا ((عومەر ئۆنباشی)) دەرکەوت.

- وتم نازانم، جەندرمەکان بانگیان کرد.. کە وام گوت وتی:

- برۆ ژوورەوە، ڕامەوەستە.. مەترسە بۆ ئێوە هیچ نابێت.. ئەفسەرەکە کاری بەوانە.. ئاغاکان تەرحیل دەکەن.. وابزانم دەڕۆن ماڵ و حاڵیان دەنووسن...

م. چ: باشە تۆ تورکی دەزانیت؟.

- کەم.. ئێستاش باش قسەی پێناکەم.. بەڵام بە تورکییەکی شل و شۆق دەدوێم.. کە ((عومەر ئونباشی)) ئەو قسانەی کرد چوومە بەر دەرگا و چاوەڕێم کرد.. دەگریام.. هاوسێکانم ئاگادار کردەوە، هەموومان دەگریاین.. زۆری نەبرد باوکی منداڵان گەڕایەوە، هات لەسەر چیچکە دانیشت و وتی:

- ئۆ و و و ف..

- چییە؟ چی بووە؟!

- چووم، وتم ((حەسەن ئونباشی)) بۆ بانگت کردووم؟ چیت دەوێت، وتی ((من بانگم نەکردوویت زابت ئاغا تۆی دەوێت))...

چوومە لای زابت ئاغا پێم گوت: ((خێرە.. بۆ بانگت کردووم؟))

وتی: ئێمە بۆ خۆزات دەبەن، پارەیەکی وام پێ نییە.. چەند قروشێکمان بۆ بێنە، تا لەوێ منداڵەکان ڕەزیل و سەفیل نەبن)).. وتم: ((ئێوە برۆن من پێتان دەگەم و پارەشت بۆ دێنم..)).

بۆ بەیانییەکەی، بەیانی زوو، یەکێك لە هاوسێکان ناوی ((مەمەد)) بوو، هەندێك شڕ و شێتاڵی لە بارگیرێك بارکردووە و منداڵێکیشی کردبووە سەربار.. مێردەکەم لێی پرسی:

- ئەوە خێرە.. بۆ کوێ؟.

وتی: مەپرسە، ئاغاکانی بنەماڵەی ((ئەیوب))یان، هێناوە بۆ ((سولسالآن)) وابزانم دەیانکوژن..

دورسون[*]: ((سولسالآن)) لە دێکەمانەوە نزیکە، ئەوێ دەشتاییەکی ڕەقەنەیە.. لەوێدا، خاوەن ئاژەڵەکان، خوێیان لەبەر مەڕەکانیان دادەنا، ناوەکەشی هەر لەوەوە وەرگیراوە ((خوێلێنەکە)).

بێزە: باوکی منداڵەکانم وتی: وا ((خاتوون))یان برد، وادیارە ئەمانیش دەکوژن...

خۆر هەڵهات ((ناریکە))ی خێزانی جەمشید ئاغا هات، براکەی عەلی شان و برازاکەی جەمشید ئاغا ((حوسێن خەیری))یشی لەگەڵدابوو..

دورسون: ((برا)) کوڕی عەلی شانە.

بێزە: لە سەرووی دێکەوە، کانییەك هەیە ((تاریکە)) لەوێوە دەهات، عومەر ئۆنباشی وتی:

- بۆ کوێ دەڕۆیت؟

ناریکە: جەمشید ئاغایان هێناوە، بەڵام نازانم لە کوێیە، بە دوای جەمشید ئاغادا دەگەڕێم دەمەوێت بۆ لای بچم... ئۆنباشی: دواجار دەزانیت لە کوێیە.. ئێستا چاوەڕێ مەکە.. لێرە دوورکەوەو بڕۆ..

تومەز جەمشید ئاغایان بردووە بۆ ((چریکە)) لەوێ کوشتوویانە و لێبوونەتەوە...

((ناریکە)) و ((عومەر)) ئاوا قسەیان دەکرد، تەماشامان کرد، لەولاوە ((خدر)) پەیدا بوو، ((خدری کوڕی جەمشید ئاغا)) کە نەوەی ((مەمەدالی ئاغایە)).. خدر لێیان نزیك بووەوە، کەمێك دوور راوەستا.. ناریکە دووبارە گوتی: جەمشید ئاغا لە کوێیە؟ دەڕۆم دەیبینم..

عومەر ئۆنباشی، تووڕە بوو،

- منداڵەکانت ببە و بڕۆ، لەمناوە مەمێنە..

---

* کوڕی بێزەیە.. جار جارە دەهاتە ناوەوە و هەندێك ڕوونکردنەوەی دەدا.. (م. چ)

- دەمەوێ بیبینم..

عومەر، دووبارە تووڕە بوو ((منداڵەکانت ببەو بڕۆ)).

دورسون: ((عومەر ئۆنباشی)) حەزی نەدەکرد، منداڵەکانی تووش بن، داوای لێ دەکرد بڕوات و دوور بکەوێتەوە.. بەڵام ((ناریکە)) ڕووی کردە ئێمە: ((ئێوە نازانن جەمشید ئاغایان بۆ کوێ بردووە؟... بەڵام ئێمە هیچمان نەگوت و وەڵاممان نەدایەوە... ((ناریکە)) لەبەردەم دەرگای ((عومەر)) دانیشتبوو، ژنەکەی ((عومەر)) قاوەی بۆ کرد و هێنای.. ((حوسێن خدر)) لەولاوە دانیشتبوو، قاوەکەی دایە ئەو، وتی: ((من بە ڕۆژووم، ئەمشەو لە خەونمدا (سید حاجی)م بینی، لەبەر ئەوە ڕۆژووم گرتووە. (سەید حاجی) پیری ئەو بنەماڵەیە بوو)).. جەمشید هەموو جارێك دەیگوت: ((هەر کاتێك (سەید حاجی) بێتە خەونمان، کاروبارمان باش دەبێت، ناخۆشیمان لێ دوور دەکەوێتەوە)).. ((عومەر ئۆنباشی)) وتی:

- ئێوە دوای چی کەوتوون.. ئەمە چییە.. وەلێ بڕۆن.. کە وای گوت ((نارە خاتوون)) هەستاو چووە ژوورەوە... هاوسێیەکمان هەبوو، ناوی ((ئاواس)) بوو. چووە لای دەرگاکەوە وتی:

- ناریکە.. دەستەسرێك زەردی دایە دەست ژنەکەی عومەرەوە وابزانم زێڕی تێدا بوو...

زانیمان ((بەرتیلی)) پێداوە...

عەمەریش، لەم کاتەدا بۆ شوێنی بێ تەلی دەکرد.. دەیگوت ((ژنەکەی جەمشید هاتووە هەواڵی جەمشید دەپرسێت، هەرچەندە دەکۆشم ناڕوات...))

لەگەڵ کێ قسەی دەکرد، چییان پێ دەگوت، نازانم... عومەر هاتە ئەم لاوە وتی: ((نارە خاتوون، ڕاستییەکەیت پێ بڵێم، شت و مەکەکانتان (قەید) کراوە، (تەرحیل)تان دەکەن..))

کە وای گوت، نارە وتی:

- ئەم خدر ئەفەندییە، کەفیلی منە، دواجار، ڕووی کردە خدر، ((خدر ئەفەندی بڕۆ بۆ لای پەری خان، پێی بڵێ، ئەو هەگبە سپییە گەورەکە بهێنێتە ماڵی ئێمە، هەرچی دیکە هەیە، چۆنیان دەوێ وا بینووسن..))

پەریخان، کچی ناریکەیە.

م. چ: ئەی ناریکە خۆی بۆ نەیدەویست بڕوات؟.

دورسون: پەشۆکابوو.. دەترسا.. نەڕۆیی..

بێزە: بەڵێ وابوو..

عومەر ئۆنباشی وتی:

- نابێ.. هەرچیتان هەیە و نییە، دەبێ (قەید) بکرێت..

ناریکە: من چی لە ماڵ و حاڵ بکەم؟ تەنیا جەمشید ئاغا و منداڵەکان سەلامەت بن..

بەڵام ((عومەر)) جارێکی کە وتی:

- نابێت دەبێت بڕۆیت خۆت لەوێ ئامادە بیت...

ناریکە: عومەر تکات لێدەکەم، با تەنیا ((خدر)) و ((برا)) بێن جەندرمەی خۆت نەبێت، نامەوێت جەندرمەی غەریبیان لەگەڵدا بێت.

دورسون: چەند ساڵێك بوو، قەرەقول لە دێکەماندا بوون، یەکترمان دەناسی، لەبەر ئەوەی بوو گوتی: {ئەوەی جەندرمەی خۆتن با لەگەڵمدا بێت}... لەو بڕوایەدا بوو ئەو دووانە خراپەیان لێ ناوەشێتەوە..!!

بێزە: ئیتر هەڵسان و لەگەڵ دوو سێ جەندرمەدا کەوتنە ڕێ.. کە گەیشتنە پاین ئاوایی، عومەر ئۆنباشی شاوری لێدا و هاواری کرد: ((خدر)) و ((برا)) ئێوە بگەڕێنەوە... لە پێشدا نەیانویست بگەڕێنە دواوە، جەندرمەکانی دیکە چەکیان لێڕاکێشان و بە زۆر گەڕانیانەوە.

ئێمە نەماندەزانی، چی بکەین.. پەشۆکابووین، ترس چووبووە دڵی هەمووانەوە.. لە بەیانی زووەوە کەس دەستی لە کارو فرمان نەدەچوو.. پەز و ئاژێل هەر لە ماڵدا

مابوونەوە، بەرەڵڵای یایلەکان نەکران.. مانگا، بزن، بەرخ لەو ناوانەدا بوون.. بۆ هەر لایەك دەمانڕوانی سەرباز و جەندرمە بوو.. پیادە.. سوارە دەهاتن و دەچوون... زۆری پێنەچوو، ئەو جەندرمانەی ((ناریکە خاتوون))یان بردبوو، گەڕانەوە.. ژنەکەی ((کێکی)) هاوسێمان وتی:

- وای.. وای.. سەربازەکان جلەکانیان بە خوێنەوەیە:.. ئیتر زانیمان، ناریکە و منداڵەکانیان کوشتووە.. ((عەباس))ی مامی، بەرخۆڵەکانی بۆ دەرەوەی دێ بردبوو، کە گەڕایەوە، بۆی باسکردین...

- ((من لە کەرتی سامی بووم، چاوم لێبوو چۆن ناریکە و منداڵەکانیان کوشت.. بە ((نێزە)) کوشتنیان.. کە ئەوەم بینی ترسام و بەرخەکانم کۆکردەوە و گەڕامەوە..

((کێکی ئاغا)) کچێکی بە شووی بوو لە ((سورپیان)) دادەنیشتن. ناوی ((ئانێ)) بوو.. شووی بە ((گەنجەخان)) کردبوو.. ((لەوێ دەبیسێت خەڵکێکی زۆر کوژراون، دێت بۆ سۆراخی براکانی.. ((ئانێ)) خوشکی ((زابت ئاغا)) بوو.. دێت و دەچێتە لای عومەر ئۆنباشی:

- دەمەوێت بڕۆمە چادرەکانی براکانم..

((عومەر)) دەست بە بۆڵە بۆڵ دەکات:

- ((هەموو کەسێك دێت و لە دەرگای من دەدات و یەخەی من دەگرێت. وەلبن بڕۆن..)).

ژنە، ناچار دەگەڕێتەوە.. زۆر ناڕوا لە ((چریکە)) دەکەوێتە ناو جەندرمەکانەوە... هەر لەوێ دەیکوژن...!

لەلایەکی ترەوە هەر لەو ماوەیەدا، عومەر ئۆنباشی و یووسفی کێکی بۆ ماڵی خاتوون دەڕۆن، لە ڕێگا لەسەر ڕێگاکە لاشەی ئافرەتێك کەوتبوو.. دواجار، یووسف گێڕابوویەوە گوتبووی: ((دەگەڕاینەوە، لەسەر ڕێگاکە ژنەکەی حەسەن ئەفەندی کەوتبوو، ڕوانیمان تەنیا گوللەیەك لە سنگی دابوو، کچێکی بچکۆلەشی دەبێت

بەسەر قۆڵیەوە بوو، بەڵام سەری منداڵەکە تاوێرێکی گەورەیان بەسەردا دابوو.. سەربازەکان بە بەرد سەری ئەو منداڵەیان پان کردبووەوە!

هەر لەولایانەوە، لاشەی چەند کەسێکی تر کەوتبوون بە سونگە سکیان هەڵتلیشابوو.. ئافرەتەکان لەشیان بەدەشتەوە بوو.. لاقەی کچی عازەبیان کردبوو، بەو خوێنەوە دیار بوو کە لەناو گەڵێدا ڕژابووە سەر خۆڵەکە..! وەکو دەگێڕنەوە.. لەناو ئەو گرووپەدا، یەکێك لە سەربازەکان خەڵکی دیکەیان دەبێت، ژنەکە دەناسێت.. دەبینێت زۆر دەپاڕێتەوە {ناموسم بپارێزن.. بمکوژن..}، ئەو سەربازەی کە دەیناسێت گوللەیەکی پێوە دەنێت تا دەست بۆ ناموسی درێژ نەکەن..

م. چ: باشە، با بگەڕێینەوە لای ماڵەکەی خاتوون، چییان لێکرد؟

- ماڵەکەی ئەو و چەند ماڵێکی دیکەیان تالآن کرد.. پێنج شەش ڕۆژ هەر پەزیان گوێزایەوە.. بە ئارەزووی خۆیان بەرخیان سەردەبڕی و گۆشتیان دەبرژاند.

م. چ: ئەی ئێوە چیتان کرد؟

- چی بکەین. چیمان لەدەست دەهات؟ لە شوێنێك کۆبووینەوەو سەری خۆمان کز کرد.. وتمان.. دەمانکوژن با بمانکوژن...

هەر ئەو ڕۆژە لە ((تەنەر))ەوە دووکەڵ بەرزبووەوە.

م. چ: تەنەری لۆلان؟..

- بەڵێ.. دێکە بەچاو نەدەبینرا، دووکەڵەکەی دیار بوو.. هەر لەولامانەوە دێیەکی دیکە دووکەڵی لێ بەرزبووەوە... لەپڕ لە دێی ((تاوغ Tawix))ەوە سەربازەکان پەیدا بوون.. دەمە و ئێوارە بوو.. ژمارەیان زۆر بوو.. ئەو ناوە پڕ بوو لە سەرباز، ئێمە زۆر ترساین، خۆمان کپ کرد، پێمان خۆش بوو بە گوللە بمانکوژن، نەك بە سونگی سکمان هەڵتلیشێنن.. لەژێر دارپەلکێك چادریان بۆ گەورەکەیان هەڵدا.. کەس زاتی نەدەکرد خۆی دەرخات مێردەکەم موختار بوو، لە عومەر ئۆنباشی پرسی:

- ئەگەر ویستیان خواردن بۆ پاشا ئامادە دەکەین.

- نەخێر، ئەو خواردنی کەس ناخوات...

لەو دەمەدا، دوو کەسی خەڵکی ((سەرپنانلی)) لە ماڵی ئێمەدا بوون وتیان ((ماڵەکانمان.. شت و مەکەکانمان.. مەزراکانمان هەموویان سووتاند.. وئێستا ئێمەش دەڕۆین بۆ دێکەمان، وتم:

- ئەگەر دەتانەوێ بمرن، لێرە بمرن باشترە.. دەڕۆن چی دەکەن؟ ڕێگاکان گیراون.. ئایا سەربازەکان ڕێگاتان پێ دەدەن.. خۆ بتانبینن دەتانکوژن...

لەم کاتەدا ((عومەر ئۆنباشی)) کچێکی گەنج و مێردمنداڵێکی لەگەڵدا بوو هات، وتی:

- ((خدر)) ئەمانە ڕادەستی تۆیان دەکەم، سبەی دەیاندەیتەوە دەستی خۆی، باوکی منداڵەکانم بە ئاستەم وتی:

- بابێن.. لای ئێمە بمێننەوەو لێرە بمرن باشترە..

((عومەر ئۆنباشی)) هەستی کرد ئێمە دەترسێین و پەشۆکاوین وتی:

- مەترسن، تامن لێرەم بۆ ئێوە هیچ نابێت.. یەکێك هاتە بەر دەرگاتان، یان هەر شتێك ڕووی دا ئاگادارم بکەنەوە.. باوکی منداڵەکان لەبەرانبەر ئەمەدا هیچی نەگوت:

ئەو دوو گەنجە، خوشك و برا بوون، بەیانی زوو کە جەندرمە هێرش بۆ دێکەیان دەبات، ئەم دووانە خۆیان دەرباز دەکەن و ڕادەکەن.. بەڵام تووشی کۆمەڵێك جەندرمەی دیکە دەبن، دەیانگرن و ڕادەستی ((عومەر ئۆنباشی))یان دەکەن..

ئێمە ماڵێکی گەورەمان هەبوو.. کەنگرمان کۆدەکردەوە و وشکمان دەکردەوە.. هەم بۆ خواردنی خۆمان بەکارمان دەهێنا، کە وشکیش دەبووەوە لەجیاتی ((کا)) دەماندایە ئاژەڵەکان.. لەگەڵ هاوسێکاندا وتمان:

- هەموو ئەو کەنگرە وشك بووانە لە پشتەوەی دەرگاکەوە کۆمەڵە دەکەین تا ئەگەر جەندرمە و سەرباز هاتن بۆیان نەکرێتەوە.. دواجار لەم بڕیارە پەشیمان بووینەوە و وامان نەکرد.. بیرمان لە چارەیەکی دیکە کردەوە.. لەناو ماڵەکەمانەوە دەرگایەك بۆ ئاخوڕی ئاژەڵەکان دەچوو.. لەناو ژووری ئاژەڵەکاندا چەند پەتی

ئەستوورمان بە کاریتەی میچەکەوە هەڵواسی و سەرەکەی دیکەمان کردە حەلقە.. بڕیارماندا هەر کە جەندرمە هات بچین هەمووومان گەورە و بچووك خۆمان هەڵواسین و نەکەوینە ژێر دەستیان.. یانی بەرێکەوتیش یەك جەندرمە، سەربازێك بهاتبایەتە بەر دەرگا، ئەو کارەمان ئەنجام دەدا..

چاومان لە دەرگاو پەنجەرەکان نەدەگوێزایەوە.. ئەو شەوەمان بە گریان و ترس و لەرز بەیانی کرد.. بەیانی کە ڕۆژ بووەوە لە پەنجەرەکانەوە ڕوانیمان، وا خەریکن چادرەکانیان هەڵدەکەند و خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد..

باوکی منداڵان وتی:

- عەلی بەگ، با پێکەوە بە بەهانەی کارو کاسبییەوە تا دەوروبەری دێی ((تاوغ)) بڕۆین، بزانین دەنگ و باس چییە..

ئاژەڵەکانیان دەرکرد و ڕۆیشتن...

دەوری نیوەڕۆ گەڕانەوە، هەندێك گوندییان دیتبوو، دەنگ و باسەکانیان لە زاری ئەوانەوە ئاوا دەگێڕایەوە:

((کە سەربازەکان هاتن، هەندێکمان لە دێکە نەبووین، ڕوویان لە چیاکان کردبوو.. ئەوەی لە دێ مابووەوە کۆیان کردنەوە.. دوو دوو بەیەکەوە بەستنیانەوە.. زیلین ئامادە کردبوو.. لەم کاتەدا ((حسێن چاووش)) لەولاوە پەیدا بوو، بە توند هات و هاواری دەکرد..

- لێبوردن لێبوردن دەرچووە...

قومەندانەکە، ئەمەی بیست و پێی ناخۆش دیاربوو.. کە حوسێن چاووش دەگاتە لای قومەندانەکە.. قوماندانەکە پێی دەڵێت..

- من ئەمانەم قۆڵبەست کردووە. چەکمانیش حازرە بۆ کوشتنیان، تۆ وەرە بڵێ، درەنگ گەیشتم و فریانەکەوتم هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیەنم.. با ئەمانە لەناو بەرین...

ئەویش دەڵێت: ((پاشام خۆتان دەزانن... بەڵام من کە هاتمە ئێرە ئەم مرۆڤانە ساغ و سەلیم بوون و من هەواڵی لێبوردنەکەم پێ وتیت.)) حوسێن، لە خۆزات بوو، لەوێوە هات و ((تاوغییەکانی)) لە مردنی مسۆگەر ڕزگار کرد..

م. چ: لە ((تاوغییەکان)) کەسیان نەکوژرا؟

- خێزانێك هەبوو لەوێدا ناوی {دەروێش جەمەلانلی} بوو لەو خێزانە چەند کەسێکیان کوژران.. بەڵام لە خۆزات، زۆر کوژران.. گەورە، بچووك، پیاو، ژن.. دەستیان نەپاراست.. دەیانبردنە قشڵەکان و لەوێ دەیانکوشتن.. مەمەدالی، تەمەر ئاغا، زۆری دیکە لە (کەرتی کلیسە)) کوژران.. لەو شوێنەی جەمشید ئاغای لێ کوژرا زۆر نزیکە.. دەکەوێتە ئەولای دێکەی ئێمەوە.. وەکو دەیگێڕنەوە، بەر لەوەی مەمەدالی ئاغا، بکوژن، لاشەکەی جەمشید ئاغای نیشاندەدەن، لێی دەپرسن:

- ((ئەمە دەناسێت))؟.

ئەویش دەڵێت: ((بەڵێ دەیناسم)).

م. چ: جەمشید ئاغا و مەمەدالی ئاغا، لەگەڵ حکوومەتدا نێوانیان چۆن بوو؟ چەکیان لە دژی دەوڵەت هەڵگرتبوو؟.

- نەخێر.. بەهیچ جۆرێك.. بەڵکو لە هەندێك ڕووەوە یارمەتی سەربازەکانیان دەدا.. کەچی ئاوایان لێکردن..

لە شوێنەکانی دیکە شەڕ و پێکدادان ڕوویان دا، بەڵام لای ئێمە هیچ ڕووی نەدابوو.. لەپڕ سەرباز هێرشی هێناو دەستی بە کوشتنی دانیشتووانەکە کرد..

لە ((سورپیان))یش خەڵکێکی زۆریان کوشت، ئەوانەی لەوێ کوژران ناوی هەندێکیان دەزانم: خێزانەکەی ئەفەندی، مەمێ قوویتی، خۆی و خێزانەکەی، خێزانی حوسێن، ئیبراهیمی پتکی خۆی و خێزانەکەی.. هەندێك هەبوون، ئاغایان پێ دەگوتن، بەڵام ئاغاو خاوەنی دێ نەبوون، هەموویانیان کوشت.

ئێمە کوشتنی ((سورپیانییەکان))مان بینی: لە سەرووی دیکەوە خۆمان شاردبووەوە چاومان لێبوو.. لە پێشدا ئەوانەی خەریکی کارکردن بوون لەناو

مەزراکانیاندا، کۆیان کردنەوە ئەمجارە ژنەکانیان هێنا، منداڵ و بەساڵاچووانیشیان لەگەڵدا بوون.. بە سونگە کەوتنە سك هەڵدڕینیان.

یەکێك ناوی ((یتەکاکا)) بوو، ئاگرێکیان هەڵایساند و بە چوار دەستە فڕێیان دایە ناو ئاگرەکەوە-وەك گاڵتە بکەن- لەناو ئاگرەکە گڕی گرت، لە حەژمەتدا هەوڵی دەرچوونی دەدا.. بەدەم سووتانەوە دەگەوزایەوە، بەملاو بەولادا دەهات. بووە تۆپەڵێك ئاگری بڵێسەدار تا کوڵ و کۆی دامرکا و بووە چنگێك خۆڵەمێش.. خۆڵەمێش، خۆڵەمێش، خۆڵەمێش...

لەو دێیەدا، برازایەکی ((حوسێن قوویتی)) منداڵیش بوو، توانی هەڵبێت.. هاتە لای ئێمە، مانگێك لای ئێمە مایەوە.

م. چ: دێی ((تانەرێ لولان))یان سووتاند، بەڵام چۆنیان سووتاند؟..

- زۆر دڕندانە.. زۆۆر. نەیانهێشت کەس لە ماڵەکەی خۆی بێتەدەرێ.. ئەوجا ئاگریان لە خانووەکان بەردا، بەوانەی ناویانەوە دەسووتا..

لە ((سورپیان))یش ئاگریان لە ماڵەکان بەردابوو، ئەم ((سورپیانە)) ((سورپیانی پەرتاق)) نییە.. یەکێکی دیکەیە.. ئەم ((سورپیانە)) نزیکی خۆزاتە.. سورپیانی فوراتیشی پێ ئێژن..

((عەباس ئانلی)) کە لە نەوەی سلێمان ئاغایە، لەگەڵ کوڕەکەی ((ئیبراهیم ئاغا)) و ((حەمید ئاغا))ی خۆزات کوژران.. ژنەکەی حەمید ئاغا ((دەلیفە)) کچی سەید ڕەزایە، ئەوانەی دوای لێبوردنەکە کوشتنیان.

م. چ: چی دەزانیت یان بیستووتە لەبارەی دەستدرێژی کردن بۆ نامووسی ژنانی کورد لەلایەن سەرباز و جەندرمەکانەوە؟

بێزە: زۆر لەو بابەتە ڕوویان داوە.. ژنەکەی (ئیڤیکا تەمەر ئاغا) ناوی ((سەدرە)) بوو.. زۆر جوان بوو.. دوای لاقەکردنی کوشتیوویان.. کچەکەی جەمشید ئاغا ((چاکی)) ناو بوو.. خێزانی ((تەسلیم ئەیووب ئاغا)) بوو.. لە نێوان دێی ((ئنێ)) و ((ئینجیغە))دا، ڕاستاییەك هەیە، لەوێ دوای دەستدرێژی کوشتبوویان..

شوانێك چاوی پێوە دەبێ چی لەو ژنە دەکەن.. لەپێشدا منداڵێکی بە باوەشەوە دەبێت منداڵەکەی لێ دەسێنن، تا دەستیان بگرێت وەکو بەردیك فڕێ بدەن، فڕێی دەدەن.. کەوا دەکەن ((چاکی)) هاوارێك دەکات.. شوانە دەڵێت، قیژەکەی لەو دەشتە دەنگی دەدایەوە.. ئەوجا، کەوتنە سەرخۆی، ژنەیان پاڵخست، قاچیان لەیەك ترازان بەو حاڵە دەستدرێژییان کردە سەری دواجاریش کوشتیان..

ئەوەی بەسەر دەرسیمییەکان هات کەس نەیبینێت، دوژمنەکەشم وای بەسەر نەیەت.. لەوە زیاتر چی بڵێم...

# ساڵی ٣٨ ژار بوو تۆفان بوو

م. چ: کاك حەسەن، لە پێشدا دەمەوێت بپرسم: ئێوە خەڵکی کام لای دەرسیمن؟ دێکەتان ناوی چییە؟

حەسەن: یەکەمجار بەخێربێن، فەرتان هێنا کاك مونزور.. پرسیارەکەت جوانە.. منیش ئەوەی بزانم پێتان دەڵێم.. من ((مێزگردی))م سەر بە شارەدێی ((موخوندی))م.. دێکەمان ناوی ((جانگ))ە.. من کوڕی ((سەید حوسێن بالان))م، بە خانەوادی ئێمە دەڵێن ((مالاّ سەیدیێ))، یان ماڵی ((رایبەر))، سەیدین و مورشیدین...

م. چ: وەکو بزانم ٦٠ ساڵ لەمەوبەر {مونزور چەم ساڵی ١٩٩٨ز ئەم دیمانەیەی ئەنجامداوە-ئەحمەد-}.. یانی ساڵی ١٩٣٨ز لە دەوروبەری دەرسیم گەلێك ڕووداوی گەورە و ناخۆش ڕوویان داوە، ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، لەودەمەدا گەلێك کارەسات بەسەر ئێوەدا هاتووە.. خانەوادەکەتان زیانی لێکەوتووە.. لەم بارەیەوە چی دەزانیت؟ چی زانیارییەکت هەیە پێمان بڵێت..

- بێ گومان ساڵی ١٩٣٨ز، من لە دایك نەبوو بووم، دایکم هەموو جارێك ڕووداوەکانی ئەو دەمەی بۆ دەگێڕاینەوە ((رۆڵەکانم، ساڵی ٣٨ هەرگیز لەبیر مەکەن..)). ئەوە دەردێکی گران بوو، ژەهرێکی کاریگەر بوو.. کە منداڵ بووین تێنەگەیشتبووین چی ڕووی داوە.. عەقڵمان بۆی نەدەچوو.. ساڵی ٣٨ چی بوو.. چی نەبوو، ئەو ڕووداوانە بۆ ڕوویان دا، چۆن ڕوویاندا، نەمان دەپرسی... خوێندنی ناوەندیمان تەواو کرد، چووینە قۆناغی باڵاتر، کەوتینە مەراقەوە تا ڕاستی مەسەلەکان بزانین.. بۆ ئەمە گەلێك پرسیارمان لە دایك و باوکمان دەکرد... بەلاّم دەبێت ئەو ڕاستییە بڵێم: ئەوەی لەم بارەوە زانیاریم پەیدا کرد سەرچاوەکەی دایکم

بوو.. خەڵکانی دیکە و باوکم باسیان نەدەکرد.. بەڵام کەم و زۆر، لە گفتوگۆکاندا، لە کۆبوونەوەکاندا، لەمبارەوە قسەکراوە، باس دەکرا... لە ڕۆژانی ڕۆژووی ((خدر))دا باسی زۆر شت دەکرا، ئێمەش گوێمان لێدەگرتن.. بەڵام باس و گێڕانەوەکانی دایکم کاریگەری زۆری کردە سەرم و شتێکی دیکە بوو.. ڕووداوەکان لەلایەن دایکمەوە وەك مەتەڵ و حەکایەت بوون بۆ ئێمە دەگێڕایەوە.. یەکە یەکە تێی دەگەیاندین.. ئێمە دەمانپرسی، ئەو وەڵامی دەدایەوە.. زۆرجار، باوکم ڕووی لە دایکم دەکرد: ((ژنەکە چییە لای منداڵەکان دانیشتووی و خەریکی عەقڵیان تێکدەدەیت؟ وازیان لێ بهێنە با خەریکی خوێندنەکەیان بن)).. دایکم بە قسەی باوکمی نەدەکرد، بەردەوام باسی ساڵی ٣٨ی بۆ دەکردین، ئەو کارەساتە، ئەو ژەهرە قەت لەبیری دەرنەدەچوو.. ئەو کارەساتە زامێکی قووڵی لە ناخیدا جێهێشتبوو سارێژ نەدەبوو...

م. چ: یانی باوکت حەزی نەدەکرد، ئێوە ئاگاداری ئەو کارەساتەبن؟

- حەزی نەدەکرد بیزانین...

م. چ: باوکت ساڵی ١٩٣٨ز، دایکتی خواستبوو؟

- نەخێر.. پێشتر، برا گەورەکەم ئەو ساڵە ٣ ساڵان بووە.

م. چ: دایکت ناوی چییە؟

- دایکم ناوی ((فیدان))ە،-یانی نەمام-، بەڵام باڵای کورت بوو، لەو ڕووەوە پێمان دەگوت ((تۆ فیدانی، بەڵام چ فیدانی))- ئاوا سەرمان دەخستە سەری... دایکم لە بنەماڵەی ئاغاکانە.. باوکم ڕەدووی کردبوو، دایکم کەمێك تورکیشی دەزانی.

م. چ: لە بەرەی کام ئاغایانە؟

- لە ((شادیە))کانە.. خاڵوانم ئاغای دێکەمانن، لە سەفەربەلك باپیرەم ((باوکی دایکم)) بۆ دەوروبەری ((مەلاتیان)) بۆ ((شێرۆ)) ڕاگوێزراون.. ئەو لەوێ کەمێ تورکی فێر دەبێت، تورکییەکەی دایکم، لە تورکییەکەی باوکم باشترە... کە ساڵی ١٩٣٨ز سەربازەکان هاتوون ماڵەکەیان سووتاندووین و بە تورکی دوواون، دایکم لێیان تێگەیشتووە و زانیوویەتی چ دەڵێن..

م. چ: ساڵی ٣٨، سەربازەکان چۆن هاتوون و چییان کردووە؟ دایکت چۆنی گێڕاوەتەوە؟.

- ئاوا بۆی دەگێڕاینەوە: ڕۆڵەکانم، ساڵی ٣٨، دووکەڵ هەموو لایەکی داپۆشیبوو..! چاو چاوی نەدەدی، ساڵی ترس و شڵەژان و پەرێشانی بوو، ئەو ساڵە... کەس زاتی نەدەکرد، لە دێیەکەوە بۆ دێیەکی دیکە بڕوات.. ڕۆژێکیان، سەرباز مێرووله ئاسا بەڕیز هاتن.. هاتن، گەیشتنە نزیکی ماڵی ئێمە.. هەر کە گەیشتن گەماڵەکانیان بەر گوللەدا، دوو گەماڵمان هەبوو، هەر لەبەر دەرگا بەر گوللەیاندان.. باوکم، دوو برای هەبوو، مامە گەورەکەم ناوی ((دوزگون))ە، ئەوەی لە باوکم بچووکتر بوو ناوی ((سافی))یە.. سافی ئەودەمە ١٤-١٥ ساڵان بووە.. کە سەگەکانیان کوشت سافی هێرش دەکاتە سەر سەربازەکە، سەربازەکە ڕووی پێنج تیرەکەی لێدەکات. داپیرم لەوێ دەبێت، زوو دەچێتە پێشی بە سەربازەکە دەڵێت من بکوژە، ئەو مەکوژە.. سەربازەکە وازی لێدێنێت..

پیاوەکان لە دێکەدا نەمابوون، هەندێکیان بۆ ناحییەکەیان بانگ کردبوو.. هەندێکی دیکەشیان لە ترساندا ڕوویان لە چیاکان کردبوو.. زۆری نەبرد، سەربازەکان ئابلۆقەی ماڵەکانیان دا، قوموتانەکەش لەژێر دارتوویەکی نزیکی ماڵمان لەسەر کورسییەك دانیشتبوو...

م. چ: خێزانەکانیان کۆ نەکردەوە؟

- نەخێر.. با ئەوەشتان پێ بڵێم.. ماڵەکەمان، لەناو دێکەدا نەبوو، تەنیا ماڵ بووین، لە نێوان دوو دێدا بووین.. لە نێوان ((جانیك)) و دێی ((کار))دا بووین.. جێگاکەی ئێمە پێی ئێژن ((نالاکار))، ئێستا تورکەکان ناوەکەیان گۆڕیوە ((سولونتاش Suluntas))ی پێدەڵێن.. ((جانیك))یشیان کردووە بە ((ئایدنلك Aydinlik))..

با بگەڕێمەوە سەر گێڕانەوەکەی دایکم:... ئاوای دەگوت ((....سەربازەکان موختاری گوندەکەیان لەگەڵدا بوو، ناوی ((کالی)) بوو.. لە ترسا دەلەرزی و زەرد

هەڵگەڕابووەوە.. پێمان گوت: تۆ موختاری، سەگەکانیان کوشتین، بۆ دەنگ ناکەیت؟.

کالی وتی: ((ڕاوەستن با بزانین بارودۆخەکە چۆن دەبێت، چیمان لێدەکەن، با بیانبینم.. ئێوە خەمی خۆتان نییە، خەمی گەماڵەکانتانە!؟))..

ئێمە هەموو، چووینە حەوشەوە و دەرگامان داخست، پەنجەرەکانی ماڵەکەمان بچووك بوون، دەچووین بە دزییەوە دەمانڕوانی.. دوای ماوەیەك، کالی هاتە ماڵ وتی: ((دەیانەوێت هەمووتان دەرچینە دەرەوە، داوای (خاوەن ماڵ) دەکەن.. وتمان بۆ (موخندی) ڕیشتووە و لێرە نییە.. وتیان، بۆ ڕۆیشتووە، وتمان حکوومەت داوای کردبوو))...

- وا دەردەکەوێت، مامم بەر لە سەربازەکان ڕۆیشتبوو.

دایکم دەیگوت: هەندێك چەکداری میلیشیا ((جاش-ئەحمەد-)) هاتن و ((باوا))یان لەگەڵ خۆیاندا برد..

((دایکم ناوی ئەو چەکدارانەشی بۆ دەوتین، بەڵام ئێستا لەبیرم نەماون)).. دایکم لەسەری دەڕۆیشت دەیگوت:

((دوای ئەم وتووێژە، سەربازەکان ئەمجارەیان وتیان: خەبەر بنێرن با ((دوزگون باوا)) بێتەوە..)) دەیانگوت بەڵام، ئەوان خۆیان بە شوێنیاندا نارد.. ئێمە هەر لە ژوورەوە بووین، دەرنەدەچووینە دەرەوە، دنیا گەرم بوو، حاڵێکی خراپمان هەبوو.. ئەو دەستیان کردە کۆکردنەوەی دانیشتووانی دێکانی دەوروبەریش.. هەندێك خەبەریان بۆ ناردن، بە پێی خۆیان ئامادە بوون. هەندێکیش سەربازەکان بە زۆر هێنایانیان.. ئێمە بێستانمان هەبوو، گوندۆرە و شووتی پێگەیی بوو، سەربازەکان دوای تێر بوون، ئەسپ و هێسترەکانیان تێدا بەرەڵاکرد..

دوای ماوەیەکی کەم، ئەمجارە موختار هات و پێی ڕاگەیاندین ((خۆتان و منداڵەکانتان وەرنە دەرەوە)).. دایکم دەیگوت: کەوتینە گومانەوە.. بەخۆماندا کەوتین، هەندێك شتی پێویستمان لەگەڵ خۆدا هەڵگرت.. بەڵاك موختار وتی:

((ئەشیاکانتان دانێن، ڕاکەن و خۆتان قورتار بکەن..)).. وای پێ گوتین.. ئێمەش منداڵەکانمان هەڵگرت و سنگمان دەکوتاو لەخۆمان دەدا.. بە ڕاکردن دوورکەوتینەوە، هەر لەو کاتەدا سەربازەکان شاڵاویان بۆ ماڵەکانمان برد و چوونە ژوورەوە.. لەگەڵ سەربازەکاندا چەکداری میلیشیا هەبوو {جاش-ئەحمەد}، زۆربەی میلیشییەکانمان نەدەناسی، کە چوونە ژوورەوە، هیزەی پڕ لە ڕۆن و هەمبانەی کەشکیان بە شاندا دەدا.. ئێمەش ڕوومان کردە دێی ((زیارەت))..

م. چ: ئەو شوێنە، بەڕاستییەوە شوێنی زیارەتکردن بوو؟

- ئا.. بەڵێ.. ئەوێ جێگای زیارەتکردنە. خەڵکی لەوێدا مەڕ و بەرخی بە قوربانی دەکرد، مۆمیان دادەگیرساند، نان ((نانی نیاز))یان دەبەخشییەوە و نزایان دەکرد.. مردووەکانیشمان لەوێدا دەناشت، یانی گۆڕستانی باو و باپیرانمان بوو.. ئەوێ داری گەورە و گا بەردی گەورە گەورەی هەیە، خەڵکی زیارەتی ئەو دارانەیان دەکرد.. کەس ئەو دارانەی نەدەبڕییەوە.. بە گوناحیان دەزانی،... با بگەڕێمەوە سەر قسەکانی دایکم، دایکم دەیگوت: سەربازەکان لە دوای ئێمەوە، بۆمبیان خستە ژێر خانووەکان و ڕووخاندنیان، -دایکم کاتێك ئەمەی دەگێڕایەوە ئازار و خەم و ترس و شڵەژانی ئەو ڕۆژانەیت لە ڕوویدا دەبینی-

م. چ: کە ماڵەکانیان ڕووخاند، شت و مەکەکانیشیان تێدا بوو؟

- بەڵێ.. هیچیان بۆ دەرنەچوو..

بە دایکم دەگوت، دایە نازانیت کێ خانووەکەی ئێمەی ڕووخاند؟

دایکم دەیگوت: بەڵێ.. قەت لە بیرم دەرناچێت.. موختار یەکەم کەس بوو..

دەمگوت: بۆ دایکە؟

دەیگوت: سەربازەکان فەرمانیان پێ دا..

دایکم لە سەری دەڕۆیشت دەیگوت: لەوێدا چوار ڕۆژ ماینەوە.. ماڵ و حاڵمان نەما.. ئاژەڵەکانمان، گاو مانگاو پەزەکانمان لەو ناوەدا بێخودان دەخولانەوە.. بەو دەشتەدا داغان ببوون. قاپ و قاچاغ، نوێن، لێفە و دۆشەك، جلوبەرگ هیچمان بۆ

نەمایەوە.. دوای ڕووخاندنیماڵەکان، ناوی گەلێك کەس دەخوێننەوە، داوای تەسلیم بوونیان دەکەن، ئەوەی لەناو خەڵکیدا دیاربوو، ئەوەی جێگای پرس و ڕا بوو، زۆرتر ئەوانەیان مەبەست بوو و مکوڕ بوون لەسەر خۆبەدەستەوە دانیان.. لەونە: ماڵباتی میکی، کەسوکاری بیلو، ماڵ و منداڵی گیدو.. زۆری دیکەش.. هەندێك خۆیان رادەستی سەربازەکان کرد، هەشبوو بەزۆر هێنایانن..

((دایکم دەیگوت: مامت هێشتا نەگەڕابووەوە، سەربازەکان لەوێ نەمان، بەڵام بە میلیشییەکانیان گوتبوو کە ((باوا)) هاتەوە بیگرن و بیهێنن بۆ سەربازگەکە...))

دوایی کە مامم هاتبووەوە، گرتبوویان و بردبوویان بۆ سەربازگەکە لەوێ ڕیش و سمێڵیان تاشی بوو..

م. چ: بۆ ڕیش و سمێڵیان تاشی بوو؟

- مام مورشید بوو، خەڵکی زۆریان ڕێز لێ دەگرت، خۆت دەزانی لەنێو (عەلەوییەکاندا) ڕیش و سمێڵ چەند باوەو بەلایانەوە پێویست و گرنگە.. وایان لێکردبوو، تاکو لەناو خەڵکەکەدا ڕێز و خۆشەویستی لەدەست بدات و خەڵکی بە قسەی نەکەن...

باوکم، لەو دەمەدا، لە ماڵ نابێت، بۆ دەوروبەری دەرسیم چووبوو..

م. چ: بۆ؟

- پێیانگوتبوو، دەنگ و باس باش نییە، بڕۆ ماوەیەك لەم ناوە خۆت ونکە، تا بزانین ئەنجام بەچی دەگات کە ئارام بووەوە وەرەوە.. ئەویش دەڕواتە ناو {تالیبییەکان} کە مامم دەگەڕێتەوە، میلیشیاکان پێی دەڵێن: ((سەربازەکان تۆیان دەوێت دەبێت بۆ لایان بڕۆیت..))

خەڵکەکە بەنیازی یارمەتی و هاودەنگییەوە حەزناکەن بڕوات، دەڵێن: ((نەڕۆیت.. خۆت دوورخەرەوە، لەبەرچاو مەمێنە، بزانین چۆن دەبێت))، بەڵام ئەو، بە قسەیان ناکات و دەڕوات.. دایکم دەیگوت: ((مامت بە قسەی کەسی نەکرد..

وتبووی.. نەخێر.. سەرباز هاتووە ماڵمانی ڕووخاندووە، دەڕۆم دەپرسم، بۆ وایان کردووە..! ئەمە چۆن دەبێت؟ گوناحمان چییە؟ کێمان کوشتووە؟.. دەڕۆم...

م. چ: بۆ ((موخوندی)) ڕۆیشت؟

- نەخێر، ئەمجارە چووە ((مێزگر)).. لەوێ یەکڕاست دەڕواتە لای قائیمقام، خۆی پێ دەناسێنێت، دەڵێت: ((من جانقلی باوام)) داوای منتان کردبوو.. مەسەلە چییە؟.

قائیمقام، تەماشای لیستی ناوەکان دەکات، دەڵێت:

- بەڵێ، ناوی تۆشی تێدایە.. وەرن بیبەن..

مامم بۆ مزگەوت دەبەن، لە ((مێزگر)) سوننی بە موسڵمان نازانن.. کە دەیبەنە مزگەوتەکەوە دەبینێت، مزگەوت پڕە و یەکێکی کە ناگرێت.. ماڵ و منداڵەکانی مەلو، ماڵی میگو، ماڵ و منداڵی گیدوجان، سەید، پیری تەریقەت، ڕەهبەر، ئاغا.. ئەوەی ناسراو و ناودارە و بەر دەستیان کەوتبێت هێناویانە..

ماڵبادی بیلو، لە هۆزی ((ئیزولیان))ن، و لە دێی ((ئاخ کلێسە)) دادەنیشتن، میکی لە هۆزی ((شادیانن)) دێکەیان ناوی ((دیربان))ە، تورکەکان ئەو ناوەیان گۆڕیوە و کردوویانە بە {قزل قەڵا Kizil Kale}، مەمەد ئەفەندی گێدوگان لە هۆزی ((ئیزولیان))ە، دێکەیان ناوی ((مەستانە))یە.

دوای یەك دوو ڕۆژ، دوو دوو بەیەکەوە باڵبەستیان دەکەن، بۆ خوارووی ((مێزگر))یان دەبەن، لەوێ شوێنیك هەیە پێی دەڵێن ((قەرەبوغاز))، لەوێدا هەموویان بە سونگی دەکوژن و لەو بانەوە فڕێیان دەدەنە دۆڵێکەوە، ئەو ڕۆژە لەوێدا ١٥٥ مرۆڤ بەو شێوەیە کوژران، ئەو ١٥٥ کەسە کە لە مێزگر کۆمەڵکوژی کران، یەکەم کاروانی قوربانییەکانی ساڵی ٣٨ بوون.. دایکم و باوکم دەڵێن: ((لافاوێك بوو هات، یەکەم شەپۆڵی ئەو لافاوە ئێمەی گرتەوە..)).

لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەدا، تەنیا سێ پاسەوان دەبن، دوو سەرباز و میلیشیایەك، لەو کاتەدا لە نێوان خۆیاندا دەدوێن {گیراوەکان}، با ئەم پاسەوانانە دەستگیر بکەین، ئەگەر یەك دووانیشمان بکوژرێت ئەوانی دیکە ڕزگاریان دەبێت..

دەوڵەت نیازی خراپە و دەمانکوژن. هەندێکیان وا دەڵێن.. بەڵام هەندێکی دیکەیان دەڵێن: جاریٚ ڕاوەستن، لە خۆڕایی کارەساتێك مەقەومێنن.. ئێمە چیمان کردووە تا بمانکوژن.. نامانکوژن..))..

ڕێك ناکەون.. بۆ بەیانییەکەی هەموویان دەبەن و دەیانکوژن.. دایکم دەیگوت: لاشەی مامتمان دەست نەکەوت، نەشمان توانی بڕۆین بیهێنینەوەو بینێژین.. مامت گۆڕی نییە.. لە ترسا کەس نەیدەوێرا سەرهەڵبڕێت و بەدوای لاشەی کەس و کاریدا بگەڕێت.. پرسیارکردن لەو بارەیەوە قەدەغە بوو.. کیٚ پرسیاری بکردایە ئەویشیان دەکوشت.. گەڕان بەو شوێنانەدا یاساغ بوو.. دەیانگوت: هەڵبەتە ئیشێکت لەم ناوانەدا هەیە، بۆیە هاتوویت...!!.

م. چ: کە لە مزگەوتەکە دەریاندێنن، خەڵکی بینیبوویان؟

- من لە ناوەندی بووم لە ((مێزگر)) کابرایەك هەبوو ناوی ((عەلی)) بوو، فەراشی قائیمقام بوو. یەکترمان دەناسی، تا مامم کاتی چووە بۆ مێزگر ئەسپەکەی دابووە دەستی ئەو کابرایە.. ئەو ((عەلی))یە دەیگوت: لە دەوروبەری ((مێزگر)) لە خوار دێی ((کوپك))ەوە، ئاواییەك هەیە پێی دەڵێن ((کەڤریٚ شیریٚ))، لەو دێیەدا ٠(موریدێك)) دەبێت، بەر لە ساڵی ١٩٣٨ز ڕۆژێکیان لە ڕۆژووی ((خزر))دا، ((موغوندی)) کۆدەبنەوە، کۆبوونەوەی ((خزری)) پیٚ دەڵێن. خەڵکێکی زۆر لەویٚ ئامادە دەبن، مامم لە جێگای شێخ و رابەر دادەنیشێت، وەعز دادەر و قسەکەر هەر مامم دەبێت، دوای ((نیاز)) دابەشکردن لە هەڵستاندا دەبن، لەکاتی قسە و باسکردندا ئەو موریدە {شێخ جافەر} بە مامم دەڵێت: ((دوزگن باوا، ڕەهبەرم، من بەردەوام گویٚ لە تۆ دەگرم، دڵم بە قسەکانت دەکرێتەوە، خودا ئەوەندەی دیکەت بداتیٚ.. پرسیارێکم هەیە: دەبێت مردنت چۆن بێت؟!.. مامم پێی دەڵێت ((شێخ جافەر)) مردنی تۆ چۆن دەبێت، هی منیش ئاوا دەبێت..)) بەڵیٚ، ڕێك وا دەرچوو، ((عەلی)) وتی: کاتێك لە مێزگر دوو دوو خەڵکەکەیان بەستەوە، ئەو موریدە دەستی لەگەڵ دەستی ((باوا))دا بەیەکەوە بەسترانەوە)) خەڵکی ئێستاش ئەوە دەگێڕنەوە...

ئەوەی ڕاستی بێت، مامم تەنیا کابرایەکی دیندار نەبوو، خوێندەوارییەکی باشی هەبوو.. لەکاتی خۆی مەکتەبی ڕوشدییەی تەواو کردبوو.. لە ((موخوندی)) مەمێ سێلێ هەبوو، لەبیرم باش نەماوە، ڕەنگە ((مەمێ تۆرێ)) بێت.. ئەویش باسی مامم دەکات و دەڵێت: ((کە (باوا)یان هێنا، ئێمە بە مەراقەوە لە پشت دەرگاوە تەماشامان دەکرد.. لە بازاڕ کە دەیانبرد، چاوی بەمن کەوت، بەری کردە دواوە، دەستی بەسترابووەوە، بەسەر ئاماژەی پێداین.. بڕۆن لێرە مەمێنن، بەو مانایە تەماشای کردین..

((مەمەد)) کە ئێستا نەماوە مردووە، لە ماڵی ئێمە ئاوای دەگوت، خۆم ئەوەم بیستووە.. ئەم دەنگ و باسانە هەمیشە خەڵکی دەیانگێڕێتەوە، هەندێکی بووە بە بەیت و گۆرانی و کەوتووەتە دەمی خەڵکی... سترانێك هەیە باوکم زۆرجار لەبەر خۆیەوە دەیوتەوە.. هەندێکجار ئێمە داوامان لێدەکرد بۆمانی بڵێ:

((ئەو کو مستەفا کەمال ئانی سەر میللەتێ من

کافرێ بەرێ نە ئاینە سەر پێغەمبەری بەری))

م. چ: لێرەدا دەمەوێت پرسیارێکی دیکەت لێ بکەم.. لەنێوان خانەوادەکەی ئێوە و دەوڵەتدا ناکۆکییەك هەبوو..؟

- نەخێر.. هیچ لە نێوانمان ڕووی نەدابوو.. پێشتر گوتم، ئێمە سەیدین.. هیچ کاتێك چەکمان هەڵنەگرتووە.. ڕۆمان لە چیا نەکردووە.. دژی دەوڵەت هیچمان نەکردووە..

زۆرجار لە دایکم دەپرسی: بۆ وایان لێ کردین.. ئەوەچی بوو.. بۆ مامیان کوشتم..؟ بۆ ئەو هەموو خەڵکەیان قەتلوعام کرد؟ لەسەرچی؟ چیان کردبوو؟.. دەیگوت:

((چۆن سێلێك دێت و هەرچی بکەوێتە بەردەمی دایەماڵی و دەیبات، ئەوانیش ئاوا.. کەس نەیدەپرسی تۆ چیت کردووە، یان گوناهت چییە؟ پیاوە ناودارەکانیان

کۆکردەوە و بردنیان.. تۆفانەکە بردیانی.. گوناهی هەبوو بێت یان نەبووبێت گرنگ نەبوو.. ئەوەی تووش بوو فەوتا، کوژرا.. بڕیار وابوو...

((ئەوانەیان چۆن دەستنیشان کردبوو؟)) ئەمەم لە دایکم پرسی: دایکم سوێندی دەخوارد: ((عەلی یلدرم))و ((خدێ بەکۆ)) دەستیان لەوەدا هەبوو، زانیارییان بۆ دەوڵەت کۆدەکردەوە.. دەمپرسی: ئێوە دڵنیان لەوەی ئەم دوو کەسە دەستیان لەم کارەساتەدا هەبووە؟.

باوکم و دایکم دەیانگوت: ((هیچ گومانمان نییە...)).

م. چ: من سەرنجم بۆ لایەکی دیکە دەڕوات، لەو کارەساتەدا ئەوەی زیانی زۆری بەرکەوتبێت، ڕەهبەر و پیرو مورشیدەکان بوون، سەرەڕای کوشتنیان ئەتك کراون، لەناو عەلەوییەکاندا، ڕیش و سمێڵ سومبوڵە، سمێڵ بڕین لای عەلەوییەکان هیچ شتێك جێگەی ناگرێتەوە... بەلای تۆوە، مەبەست لەمە چی بوو؟!

- مەبەستی سەرەکی لەو جۆرە کردەوانە ئەوەبوو لەناو خەڵکیدا ئیعتباریان نەمێنێت. پێوەندییان بپچڕێت، گومان لە قسە و داواکانیان بکەن.. هەموو خەڵکی وادەڵێن... وایان لێدەکردن تا لەبەر چاوی میللەت بچووك دیاربن.. دەوڵەت دوژمنی سەرسەختی عەلەوییەکانن..

م. چ: خیزانەکەی ئێوە کەوتە بەر ((تەرحیل))؟

- لە دەوروبەری ((مێزگر)) تەرحیل زۆر نەکرا.. تەنیا لە ((موغوندی)) ماڵباتی ((سەید حوسێن)) ڕاگوێزران..

م. چ: باشە، خۆ ((سەید حوسێن)) لە سەرەتاوە، تا دوایی لایەنگری دەوڵەت بوو.. سەرەڕای ئەوەش تەرحیل کرا؟..

- بەڵێ.. یارمەتی دەوڵەتی دەدا، ڕاستە.. تا چووبووە لای ((سەید ڕەزا)) وتبووی: ((وەرن خۆتان تەسلیم بکەن..)).. خەڵکی زۆر باسی ئەمەی دەکات...

م. چ: (تەرحیل)یش کرا؟!

- بەڵێ.. ئەوەندە خزمەتی دەوڵەتی کرد و تەرحیلیش کرا...!!. من خۆم ((سەید حوسێن))م بینیوە.. ئەوان موریدی ئێمە بوون...

م. چ: ((مورشید حسین)) موریدی ئێوە بوو؟

- بەڵێ، کوڕی سەید حوسێنی موغوندی،.. هەتاکو ساڵی پار هاتە ماڵمان بە میوانی...

م. چ: سەید حوسێن و خێزانەکەیان بۆ کوێ تەرحیل کردن؟.

- ناردنیان بۆ ((بورصە))...

ساڵی ١٩٥٠ز هەموو کەسێك بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە... لێبوردن دەرچوو، گەڕاینەوە دێکەی خۆمان و سەرلەنوێ خانوو و بەرەمان دروستکردەوە...

م. چ: تا ئەو کاتە ئێوە لە کوێ بوون؟

- ماڵی خاڵۆم لە ((چانیك))ە، لەوێ ماینەوە، ل ٣٨ ئێمە چووینە لای خاڵۆکانم.. من ئەو کاتە ٤-٥ ساڵان بووم.

م. چ: زۆر سوپاس...

- لە ڕاستیدا، ئێمە زۆر سوپاسی تۆ دەکەین.

## تۆفانەکەی ساڵی ٣٨ ئێمەشی گرتەوە

م. چ: خۆتمان پێ ناناسێنیت؟.

- ناوم ((زەینەڵ))ە، باوکم ناوی ((قەمەر))ە، دایکم ((ئەموسە))ی ناوە.. دێکەمان ((وارتنیگا))یە.. سەر بە هۆزی ((حەیدەران))ە دێکە نزیکی چیای ((ژێلە))یە.

م. چ: ساڵی ١٩٣٧ز، تەمەنت چەند دەبوو؟.

- ١٣ ساڵان بووم..

م. چ: مادام وایە، ئەو ساڵانەت باش لەیادە؟.

- بێ گومان.. هەموو شتێکم لەبیرە.. ئەو دەمە دەفامیم.. جاروبار چەکیشم هەڵدەگرت..

م. چ: پرسیارێکت لێدەکەم: وەکو بیستوومە ساڵی ١٩٣٧ز، ((خدۆ پەدیز)) ناوێك هەبووە لە دێکەتاندا، لەگەڵ سەربازەکاندا لەناو دێکەدا بەشەڕ هاتووە.. لەمبارەیەوە زانیاریت هەیە؟..

- بەڵێ.. تا ئێستا ئەو مەسەلەیەم لەبیرە.. چونکی خۆم بە چاوی خۆم بینیم..

م. چ: دەباشە، ئەگەر بە ئەرکی نازانی، بۆمانی بگێڕەوە.

- لە نزیکی دێکەی ئێمەوە، دێیەك هەیە پێی ئێژن ((کەکلیگە)). لەو دێیەدا ((ییڤو کەمانە)) و ((عەلی دوڵدی)) ساڵی ١٩٣٦ز ببوونە میلیشیای حکوومەت... لە ((گەریسە))ش، نەوەیەکی ((محەمەد ئاغا)) بەناوی ((ئۆسۆ کەوك)) چەکی بۆ دەوڵەت هەڵگرتبوو ئەم چەکدارانە، لە چیای ((ژێلە)) هەر لەلای قومەندان دەمانەوە، قومەندانەکە ناوی ((موئمن)) بوو..

م. چ: نازانی ئەو سوپایە، لە کوێوە هاتبوونە ئەوێ؟

- نازانم.. ڕۆژێك لەپڕ پەیدابوون.. لە ڕووباری ((سەیحان)) پەڕینەوە و چوونە چیای ((ژێلە)).. لەو کاتەدا ((حەیدەرییەکان)) هەندێکیان بۆسەیان بۆ لەشکرەکە دانابوو و بەشەڕ هاتبوون، سەربازەکان سێ هەفتە لە شوێنی خۆیان مانەوە نەیانتوانی بگەنە چیاکە.

م. چ: کێ بوون ئەوانەی ڕێگایان لە لەشکرەکە گرتبوو.. ناوەکانیان نازانیت؟

- هەندێکیانم لەبیرە.. خدرێ عەلی، کوڕەکانی حەمیدۆ، خدرێ تیمکی و چەند کەسانێکی دیکە... شەڕ هەر لەوێدا نەبوو، لە شوێنی تریش شەڕ بەرپابوو.. بەڵام تا هۆزەکان بەخۆیاندا کەوتن، سەربازەکان خۆیان گەیاندە چیای ((ژێلە)).

پێشتر وتم، لە حەیدەرییەکان ((ئیڤوکەمانە)) ببووە میلیشیا و چەکی بۆ دەوڵەت هەڵگرتبوو.. ڕۆژێکیان لەدێی ((ڕوسنەکا))-قەمۆ- ناوێك دەڕواتە لای خدر ئاغا، کە چوار ڕۆژ بەردەوام لە شەڕدا بوو، وتبووی:

- ماڵت ئاوەدان بێت خدر ئاغا.. چۆن وا هێشتا ئەم سەربازانە لێرەن و دەرت نەکردوون؟... خدر ئاغا دەڵێ: ئێمە خۆ تەنیا لەگەڵ سەربازەکاندا شەڕ ناکەین، لەگەڵ میلیشیاکانیشدا شەڕ دەکەین ((ئیڤوکەمانە))شیان لەگەڵدایە.. دە مادام هاتوویت، چەکێك هەڵگرە بڕۆ لەو قۆڵەوە دەست بە شەڕ بکە. ((قەمۆ-قەمەر-)) چەکێك هەڵدەگرێت دەڕواتە وناو ((قولە))یەکەوە، کە بەدەستی خەڵکەکەوە دەبێت..

هەر لەو ڕۆژانەدا، حەمیدێ خدر ئاغا، لەگەڵ چەند کەسێکدا دەڕۆن بۆ ((ژێلاقزە)). لەولای چیای ژێلەوە چیایەکی دیکە هەیە زۆر بەرز نییە، پێی دەڵێن ((ژیلاقزە)).. لەوێدا تووشیان دەبێتە تووشی کۆمەڵێك سەربازەوە، شەڕ دەست پێدەکات، هەشت سەرباز دەکوژن، ((حەمەدێ تیکمە)) لەوێوە دەگەڕێتەوە، تەماشا دەکات، چەکدارێك ناوی ((عەلی دولدی)) دەبێت کەوتووەتە پێشی سەربازەکان وادێت.. چاوەڕێ ناکات بە تەواوی نزیك ببنەوە، تەقەیان لێدەکات و ((عەلی دولدی)) زامدار دەکات... هەر لەم باس و حەکایەتانە..: حوسێنی تیکمی، چاوێکی کوێر دەبێت.. فڕۆکەکان لەو ناوانەدا دێن و دەچن دەڵێت:

- خدر ئاغا، ڕاوەستە با گوللەیەك بەو فڕۆكەیەوە بنێم..

بە ڕێكەوت تەقەكە دەكات لە فڕۆكەكە دەدات.. فڕۆكەوانەكە دەتوانێت خۆی بە ((ئەلەزیز)) بگەیەنێت.. فڕۆكەوانەكە دەڵێن خزمی نزیكی ئەتاتورك بووە بەناوی ((سەبیحە گوگجە)).

م. چ: با بگەڕێینەوە بۆ ڕووداوەكانی دێكەی ئێوە.. چی ڕووی دا؟

- ساڵی ۱۹۳۷ز، لە خوارەوە سەربازێكی زۆرهات.. هاتن و دێكانی ئەو تاوانەیان چۆڵ كرد.. دێكەی ئێمە ڕوویان كردە چیاكانی سەرووی دێكەمانەوە. لەوێ ئەشكەوت هەبوو، چوونە ناوئەشكەوتەكانەوە، هەندێك ماڵێش چادریان هەڵدا، ((خدۆ پتیز))ێك هەبوو، براكەی پوورزایەكی من ژنی بوو.. ناوی ((عەلی)) بوو، پوورزاكەشم ناوی ((شارەبان)) بوو.. ((خدۆ)) ڕۆژێكیان لەگەڵ ماڵی براكەیدا بۆ دێكەی ئێمە دێن، گوایە خۆیان بشارنەوە، ژنەكەی، توركییەكی باشی دەزانی، لەو ڕۆژانەدا كەم بوون ئەوانەی توركییان دەزانی... دانیشتووانی دێكەی ئێمە ئەوكاتە چووبوونە یایلاكان، ئێمە بە ڕێكەوت لەگەڵ دایكمدا لە دێكەدا بووین، خۆمان ئامادە كردبوو بۆ دروێنە بچین... من لە دوورەوە سەربازەكانم بینی بۆ دێكە دەهاتن وتم:

- باوە، سەربازەكان هاتن، با ڕاكەین..

ئەو وتی: بڕۆ هەندێك پارەم داناوە، بیهێنە و وەرە.. بە پەلە چوومە ژوورەوە، پارەكەمان لەناو خوێدانەكەماندا بوو.. دەمەكەم كردەوە و پارەكەم هێنا.. لەم دەمەدا سەربازەكان دەوری گوندەكەیان دابوو.. من وام نیاز بوو ڕاكەم و لەناو خەرمانەكاندا خۆم بشێرمەوە، بەڵام باوكم نەیهێشت، سەربازەكان هاتن و بۆ ناوەڕاستی دێكەیان بردین.. لەگەڵ ژمارەیەك كەسدا ڕایانگرتین، یوزباشی پەیدابوو، ((ئیڤو كەمانی)) لەگەڵدا بوو.. ئیڤو بە باوكمی گوت:

- خەبەریان لێتان داوە قەمەر..

باوكم وتی: كەس خەبەر نادات، مەگەر تۆ..

سەربازەکان ئەو خەڵکەیان کردە سێ بەشەوە.. بەشی یەکەم من و باوکم و عەلی ناوێکیان خستە تەك خۆیان.. دەستیان کردە ماڵ پشکنین. خەڵکەکە زۆربەیان بە زۆزانەکان بوون، دەرگای ماڵەکانیان کلۆم دابوو، سەربازەکان دەرگاکانیان دەشکاند و دەچوونە ژوورەوە، شت و مەکەکانیان بەسەر یەکدا دەدا، دەشکاند، زەخیرەیان تێکەڵی یەکتر دەکرد، هەرچی پارەو زێرێکیشیان دەدۆزییەوە لە باخەڵیانیان دەنا.. کاتێك ئەوەیان دەکرد، قاقا پێدەکەنین و لە نێوان خۆیاندا بە تورکی دەئاخاوتن، نەمدەزانی چی دەڵێن.. کە تەواو دێکەیان پشکنی، ئێمەشیان لەگەڵ خۆیاندا بردە لای کەپرەکان... لەولاوە ((کادانێك مابوو، یەکێك لە سەربازەکان دەرگای کادانەکەی کردەوەو چووە ژوورەوە، تومەز ((خدو پەتیز)) لەوێدایە. هەر لەناو کادێنەکە دەیکوژن... کە سەربازەکان بەملاو ئەولادا داغان بوون ((وتی: با ڕاکەین)).

وتم: دەمانکوژن..

بەڵام ئەو گوێی نەدا، ڕایکرد.. لەناو دێ دەنگی تەقە دەهات، کەمێك چوومە ئەولاترەوە، لەسەر کۆڵانێك ((عەلی))م بینی کەوتبوو زامدار بوو.. تومەز باوکیشم زامدار کراوە، گوللەیەك لە شانی دابوو.. تەقە لە هەموو لایەکەوە دەهات.. گوللەیەکیش بەر من کەوت.. خۆم نەگرت، کەوتم..

م. چ: کوێت زامدار بوو؟

- نەرمەی قۆڵمی گرتبوو..

بەلارە لار کەمێك خۆم دوورخستەوە، تەماشام کرد، باوکم بەرەو لای من دێت، بە حاڵ دەتوانێت ڕێ بکات، عەلی هاوسێمان هەر لەوێدا ڕوحی دەرچوو.. یوزباشی و ئیڤو، کەمێ دوور لە ئێمەوە دانیشتبوون یەکێك لە سەربازەکان نارنجۆکێکی بە دەستەوە بوو، خستییە کادانەکەوە، ئاگر و دووکەڵ بەرز بووەوە.. زۆری پێنەچوو، خەڵکی دێکە هاتن و خەبەری مردنی باوکمیان پێداین..

م. چ: ئەو ڕۆژە لەوێدا هیچ سەرباز کوژرا؟

- یەك دوو سەرباز تەقەیان لێکرابوو و کوژرابوون... لەوکاتەدا یەکێك لە میلیشییاکان ڕۆیشت ((عەلی)) برای ((خدۆی)) هێنا، زامدار بوو خستییە سەر هێسترێك و ئێمەش لەگەڵیدا ڕۆیشتین، لە ڕێگا تا گەیشتین زامەکەیان دەکولانەوە. دواجار خوێنی لێدەهات، خوێنەکەیان دەخستە سەر پێڵاوەکانیان، بەمە هەم ئازاریان دەدا، هەمیش دەیانویست بڵێن: خوێنی ئێوە بۆ پێڵاو پاککردنەوە دەشێت..!

م. چ: عەلی، نەمردبوو، هێشتا زیندوو بوو کە وایان دەکرد؟.

- بەڵێ.. هێشتا نەمردبوو، بەڵام زامەکەی سەخت بوو... بەو جۆرە گەیشتینە ((ولێ سولەسنۆ)).. تومەز ((خدۆ))ش مردووە، لاشەکەیان هێنا. بە مردوویی سەریان بڕی.. قومەندانەکە لەسەر لاشە بێ سەرەکەی خدۆ وەستا، وتی: ئەم لاشەیە کەس نەینێژێت ئەوەی بینێژێت نەوتی بەسەردا دەکەم و دەیسووتێنم، با هەر لێرە بمێنێتەوە... دوای ئەوە، سەرەکەیان خستە جواڵێکەوە لەگەڵ خۆیان بردیان.

م. چ: لاشەکەی ((خدۆ)) هەر لەوێ مایەوە..!

- بەڵێ..

م. چ: ئەی باوکت؟

- باوکم بەو برینەی مرد..

- بەو زامەوە مرد؟

- بەڵێ، منیش ١٥ ڕۆژ لە دێکە مامەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخەکە ئاڵۆزتر دەبوو، لەبەر ئەوە چوومە دێکەی ((خدر ئاغا)).

م. چ: ئەو خدر ئاغایە، هەمان ((خدێ عەلی))یە، وا نییە؟

- بەڵێ خۆیەتی ((خدرێ عەلی)) موریدێکی خدر ئاغا ناوی ((سەید عەلی)) بوو بە ٤٠ ڕۆژ زامەکەی بۆ تیمار کردم، خەڵکی دێکەش لە زۆزانەکان گەڕابوونەوە ناو دێ..

م. چ: سەید عەلی، زامەکەتی بەچی تەداوی دەکرد؟

- مەرهەمێكی بەكاردەبرد، بە فتیل پاكی دەكردەوە، ئێسكە شكاوەكانی دەردەكرد و تیماری دەكرد.

م. چ: بێ گومان بە تەواوی چاك بوویتەوە؟

- چاك بومەوە، بەڵام قۆڵێكم وەكو پێشوو نەبوو.. تاكو لە دێكەی خدر ئاغاش گەڕامەوە، لاشەكەی خدۆ، هەر لەوێدا بوو، گەرماكە تاواندبوویەوە، خاكەكەی چەور كردبوو، مێروو لێی ئاڵابوو..

م. چ: لاشەكە دەستی لێ نەدرابوو؟

- نەخێر.

م. چ: جانەوەر نەیخواردبوو؟

- نەخێر.. وەك خۆی مابووەوە، بەڵام تێكچوو بوو..

م. چ: ئەو شوێنەی خدۆی تێدا زامدار بوو، ناوی چییە؟

- كەلۆ سپێ..

م. چ: ئەی ژن و منداڵی براكەی چییان بەسەرهات؟

- عەلی، لە گردی ژێلە دەمرێت.. ((ئوسێ خدر))ی خێزانی، كچەكەی و كوڕەكەی چوونە ((پێرە)) و لەوێ مانەوە.. لەم دواییەدا كوڕەكەی ((خدۆ)) هاتبووە ((سەی خانۆ)) دواجار بیستم دوو ساڵ لەمەوبەر بۆ ئەڵمانیا چووە و لەوێ ماوەتەوە، كوڕەكەی ناوی ((چەمێ))یە..

م. چ: دوای ئەوەی چیتان كرد؟

- من بۆ ((دەواپیلە)) چووم، ئەو دێیە لەگەڵ هۆزی ((سەید ڕەزا))دا خزمن...

م. چ: دەكەوێتە كوێوە؟

- لە ناوچەی (حەیدەران)ە، لە سەرووی حەیدەرانەوە..

م. چ: كە چوویتە ((ئاوا سونی)) ئەوێ چۆن بوو، چیت بینی؟

- کاتێك لەوێ بووم، ئەوەی لە یادم دەرناچێت، هانی سەید ڕەزا بوو، ((سەید ڕەزا)) هاتە ((دەواپیلی)) لەژێر دارگوێزێکدا ڕایەخیان ڕاخست، دانیشت لەگەڵ خەڵکەکەدا دەستی بە وتووێژ کرد..

م. چ: نازانیت، لەبارەی چییەوە دەدوا؟

- نەخێر.. ئەوەی لە تەمەنی مندا بوو لەوێ دانەدەنیشت، لەو دەمەدا شەڕ لە نێوان دەرسیمییەکان و دەوڵەتدا هێشتا بەردەوام بوو.. ڕەنگە بۆ ئەو مەسەلەیە هاتبێت.. دوای ماوەیەکی کەم، لە باکوورەوە سەربازێکی زۆر بۆ ئەرزنجان و ناوچەکانی دیکە هاتن.. لێرەو لەوێ شەڕ دەقەوما.. ڕۆژێکیان نزیکەی ١٨٠ ژن و منداڵ لەگەڵ چەند چەکدارێکی خۆماندا بەرەو حەیدەران کەوتینە ڕێ.. نزیکی دێکەی خۆمان بووینەوە.. سەید حەسەن و چەکدارێکی دیکە وتیان:

- ئێمە بۆ ((وارتینیگە)) دەچین، ئێوەش یایشە یایشە بڕۆن.. ئەوان ڕۆیشتن..

سەید حەسەن، خزمی حوسێن ئاغا بوو، دێکەی حوسێن ئاغا ناوی ((دەواپیلە)) بوو، ئەوان لە ئێمە دووركەوتنەوە، سێ چەکدارمان لەگەڵدا مایەوە. حوسێن ئاغا، کوڕەکەی ((سەید عەڤدل))، سێیەمیان ناوەکەیم بیرناکەوێتەوە.. زۆر نەڕۆیشتین، لەسەر ڕێگاکەمان شیوێك هەبوو، گەیشتینە ئەو شیوە، لەوێ حوسێن ئاغا و چەکدارەکەی تر لەپێش ئێمەوە بوون، ڕێیان دەکرد.. لە دارستانەکەدا، ڕاستاییەك هەبوو، گەیشتینە ئەو ئاستە، قرمەی ڕەشاشێك هەمووومانی وەستاند.. نەخێر تەقەکان بەردەوام بوون.. چەکدارەکانی لای ئێمە چوونە ناو کۆمەڵە دارو بارێکەوە.. ئێمەش لە قەراغی شیوەکە بووین، سەربازەکان ئێمەیان لێوە دیار نەبوو.. خوارەوەی شیوەکە ئاوی پێدا دەڕۆیی.. لەو لاشمانەوە ئەشکەوتێك هەبوو، ((سەید عەڤدل)) شەڕی مان و نەمانی دەکرد.. سەید عەقدل، جار نا جارێك هێرشیان بۆ دەبات، ئەوان دەکشانەوە، ئەوجا دەگەڕایەوە سپێرەکەی خۆی. سەربازێك لێی نزیك ببووەوە ئەم ئاگاداربوو تەقەی لێکرد و کەوت، سەید چووە سەری و تفەنگەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە جێگاکەی خۆی..

م. چ: ئەی حوسێن ئاغا؟

- حوسێن و ئەو پیاوەی لەگەڵیدا بوو، ڕەشاش بەدەستێك بواری پێ نەدەدان.. بەو جۆرە شەڕ بەردەوام بوو تا ئێوارە تاریك داهات.. ئەو سەربازە زامدارە، تومەز چاودێری عەڤدل دەكات، كە هەڵدەستێت بە دەمانچەكەی تەقەی لێدەكات و لەو شوێنە عەڤدل دەكوژرێت.. ئەو پیاوەی لەگەڵ حوسێن ئاغادا دەبێت دەچێتە سەر سەربازەكە و دەیكوژێت.. ئەم ڕووداوە هەموومانی سەرسام و پەرێشان كردبوو.. یەكێ ویستی چاوی سەربازە مردووەكە دەربێنێت.. بەڵام حوسێن ئاغا نەیهێشت وتی:

((ڕێز لە مردوو بگرن.. كوڕەكەی من ئەوەی لەدەست هات كردی، مەردانە شەڕی كرد.. ئەمە كوڕی منە.. ئەو سەربازەش كوڕی دایك و باوكی خۆیەتی.. حەیف بۆ ئەو و كوڕەكەی خۆشم.. بەڵام ئەوەی بوو بوو.. چی دەكەیت و چیت لەدەست دێت..)).

دوای ئەوە، حوسێن ئاغا وتی: ((وارتنیگا)) زۆر دوور نییە، تاریك دابێت، سەرباز ناگەڕێت.. ئێوە بڕۆن، لا مەدەن.. منیش لاشەی كوڕەكەم دەبەم بۆ لای خۆمان...))

لاشەكەی ((سەید عەڤدل))یان لە هێسترێك باركرد، بەو شەوە كەوتنەڕێ، ئێمەش بەرەو ((وارتنیگا)) كەوتینەڕێ.. ئەو ساڵە لەوێماینەوە، ساڵی داهاتوو شێتگیرانەتر كەوتنە گیانی خەڵكەكە..

م. چ: لە خێزانەكەی ئێوە كەس كوژرا؟

- مامم، دایكم، خوشكێكم، برایەكم كوژران.

م. چ: مامت ناوی چی بوو؟

- حەسەن.

م. چ: براكەت لە خۆت گەورەتر بوو؟

- لەمن منداڵتر بوو..

م. چ: ناوی؟

- ئەویش ناوی حەسەن بوو..

م. چ: خوشکەکەت تەمەنی چەند بوو؟

- ١٨ ساڵان بوو.. ناوی ((شارەبان)) بوو.

م. چ: باشە، تۆ چۆن ڕزگارت بوو؟

- ساڵی ١٩٣٨ز ئێمەیان بردە ئەوبەری ڕووبار، کە سەر بە هۆزی ((ئاڵان)) بوو. من لە ((گومە مشی)) مامەوە.. ڕۆژێکیان سەربازەکان بە دێکاندا دەگەڕان، هاتنە ئەو دەوروبەرەی ئێمە، بە خەڵکەکانیان گوت:

((وەرن بۆ زستان زەخیرە و ئازووقەتان دەدەینێ..)) ئەوکاتەش دێکان چۆڵ کرابوون مەزرا و خەلەودانەکان لە شوێنی خۆیان ڕزابوون. وتبوویان وەرن گەنم و جۆتان دەدەینێ.. دوای ئەم قسانە، پیاوانی دێ کۆبوونەوە و هەموویان ڕۆیشتن، بەڵام دوو سێ ڕۆژی پێچوو نەگەڕانەوە.. دوای چوار ڕۆژ ئەمجارە سەربازەکان لە ڕێگای موختارەکانەوە خەبەریان بۆ ناردین: دەبێ گەورە و بچووکی ((حەیدەرییەکان)) خۆیان تەسلیم بکەن، ئەوەی لە دێکەدا بمێنێتەوە دەیکوژین... ئەمجا، خۆیان هاتن و هەموومانیان کۆکردەوە، لە ((گۆمێ مشێ)) دارتوو هەبوو، هەموومانیان لەوێدا کۆکردەوە، خەڵکێکی زۆریان هێنابوو، دانیشتووانی ((کورتە سورە)) ((گۆمێ مشێ)) و ((پورتك)) و ((وەلی کاسۆ)) هەموو لەوێدا کۆیان کردینەوە.. نزیکە ٦٠٠ -٧٠٠ کەسێك دەبووین.. تا ئەو کاتەش هیچ سۆراخی ئەو پیاوانە نەدەزانرا کە بۆ ئازووقەدان بردبوونیان.. دەمە و ئێوارە، ئێمەیان بردە ((وەلێ پاخێ))، لە ڕێگاکە سەرەو ژوورێك هەیە، لەوێدا بە دزییەوە هەڵگژامە سەر بەرزاییەکە و ڕامکرد.. سەربازەکان بینیمیان دەستیان بە تەقە کرد، بەڵام من خۆم ڕزگار کرد.. بۆ بەیانی ئەو هەموو مرۆڤانە لە دۆڵێکدا گوللەباران کرابوون، تومەز پیاوەکانیش کە بۆ ئازووقە هێنابوویان هەر لەوێدا قەتلوعام کرابوون.. ئەو شوێنە کە کۆمەڵکوژییەکەی تێدا ئەنجامدرا، دۆڵی ((زوخوری)) پێ دەڵێن..

م. چ: بەر لە ئێستا وتت، خدر ئاغا لەگەڵ پیاوەکانیدا لە ((سوخاریا)) لەگەڵ سەربازەکاندا شەڕیان کردووە ، ئەوە چۆن بوو.

- بەڵێ.. ڕۆژێك خدر ئاغا، لەگەڵ کوڕەکانیدا و چەند چەکدارێك دەڕۆنە ((سوخاریا)) دەبنە میوانی ((ئوسێنی گرمێ))، نازانم کێ خەبەری لێدابوون، تابورێك سەرباز دێن و دەورەی ماڵەکە دەدەن.. شەڕێکی سەخت بەرپا دەبێت، تا تاریکانێ شەڕ بەردەوام دەبێت، کە شەو دادێت، هەڵدێن. سەربازەکان دوای ئەوە دێکە دەسووتێنن.

بەر لەم ڕووداوە بە چەند ڕۆژێك، قائیمقام دەنێرێتە دووی براکەی ((ئوسێنێ گرمێ)) ناوی عەلی دەبێت.. دەچێتە ((پلیموریا)) عەلی، لەو ڕۆیشتنەی نەهاتەوە، تومەز کوشتوویانە..

م. چ: دەمەوێت بێمە سەر سەید حەسەن، چی بەسەر هات؟

- سەید حەسەن لە چیا مایەوە، چەندساڵێك هەر لە چیاکاندا بوو هەر شەڕی دەکرد.

م. چ: دوای ٣٨یش هەر شەڕی دەکرد؟

- بەڵی بەڵێ.. زۆرجاریش ((دەمەنانییەکان)) یارمەتییان دەدا.. سەید حەسەن کابرایەکی ئازا بوو، هەموو کەسێك دەیناسی.. موخابن لە دواییدا بە دەستی دەرسیمییەکان کوژرا!!!

م. چ: بۆ؟ ئەوە چۆن بوو؟

- سەید حەسەن و حەسە قەڵاکونجی هەر پێکەوە بوون، حەسە قەڵاکونجی جەنگاوەرێکی ئازا بوو، مەگەر سەید حەسەن هامتەقای ئەو بووبێت.. ڕۆژێکیان پێکەوە دەچنە ((مەزرا پاگۆ)) کە لە ئاوایی ((تولیکی یوسفۆ))وە نزیکە، لەوێ دەبنە میوانی کابرایەکی ناوی ((ئاغا)) دەبیت. کاری خەتەنە کردن بوو.. تومەز لەژێرەوە چەکی دەوڵەتی لەلایە و بووە بە میلیشیا ((جاش-ئەحمەد-))، بەڵام بەمە نازانن و مەرحەبای کونیانیش لە نێواندا دەبێت.. کاتی خەلەو خەرمان دەبێت، کە

نزیکی ماڵەکەیان دەبنەوە، دەبینن خۆی و براکەی لەسەر خەرمانەکەیانن، سەید حەسەن و حەسە قەڵاکونجی، ناچنە ناو دێکەوە تا دڵنیا دەبن کەوا سەربازی تێدا نییە، کە دەچن خانە خوێکەیان کە ((ئاغا))ی ناوە فەرموویان لێدەکات، لەپێشدا نایانەوێت بچنە ماڵەوە، بەڵام خانەخوێکەیان مکوڕ دەبێت، کە دەبێت ببنە میوانی، سەید حەسەن کە دادەنیشێت، چەکەکەی لەخۆی دوور ناخاتەوە، هەر لە باوەشیدا دەبێت.. لە خاوەن ماڵەکە دەکەوێتە گومانەوە. بە حەسە قەڵاکونجی دەڵێت هاوڕێ: ((ئەمانە دەمانکوژن))!.

حەسە قەڵا دەڵێت: نەخێر شتی وا چۆن دەبێت.. دواجار ئەو یەکێکە ئێمە دووانین.. دەڵێت: گومانم پەیدا کردووە هەڵسوکەوتیانم بەدڵ نییە... خێزانی خانەخوێکە ناوی ((پەری)) دەبێت لەولایانەوە بە ساج خەریکی نان کردن دەبێت.. مێردەکەی دەچێتە دەرەوە، پەری، لەبەر خۆیەوە دەڵێت:

((حەیف بۆ ئەم پیاوە ئازایانە...)).. کەوا دەڵێت و ئەمان گوێیان لێ دەبێت، بە تەواو دەکەونە گومانەوە. هەردووك هەڵدەستن و لە ژوورەکە دەردەچن.. برای خانەخوێکە لەولاوە دەستی لەکارا دەبێ تەقە لە حەسە قەڵا دەکات و دەکەوێت.. ((ئاغا))ش تەقە لە سەید حەسەن دەکات، بە زامداری ڕادەکات، دەتوانێت خۆی دوور بخاتەوە.. ئاغا و براکەی، لە مردنی سەید حەسەن دڵنیا نابن زۆر دەترسن.. سەید بەو زامەوە دەمرێت.. باوکی حەسەن بۆ ((قەلاکونجی)) تەرحیل کرابوو، لەوێ مایەوە تا ساڵی ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

## سەربازیمان بۆ دەوڵەت کرد و بەکارمان نەهات

م.چ. خۆتمان پێ بناسێنە.. ناوت چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ سەر بە کام هۆزیت؟

ئیبراهیم: ناوم ئیبراهیمە، بە شێوەزاری ئێمە ((ئیڤرایمێ حەسەنێ عەلیێ ئاڤاشی))م پێ ئێژن.. دێکەمان ناوی ((پیێرەسك))ە.. پیێرەسك سەر بە قەزای ((دەرسیمە-تونجەلی-)) باوکم ناوی حەسەنە..

م. چ: لە ساڵی ١٩٣٨ز چەند ساڵان بووی؟ لە رووداوەکانی ئەو ساڵە چیت لە یادە؟

- من لەو ساڵەدا، ١٠-١١ ساڵان بووم. زۆر ڕووداوی ئەو کاتەم لەیادە..

م. چ: دەفەرموو بۆمانی باس بکە؟

- دێکەمان کرابووە شارەدێ.. قەرەقولێ لە دێکەماندا هەبوو. بەڕێوەبەری شارەدێ ناوی ((حوسنی بەگ)) بوو.. نێوان دانیشتووانەکە و بەڕێوەبەرەکە باش نەبوو.. چونکە، ژنی بەڕێوەبەرکە لە ڕووی ئەخلاقەوە باشیان نەدەگوت، خەڵکەکە بە ڕاشکاوی پیانگوتبوو: ژنەکەت ڕەفتاری باش نییە، حەز ناکەین لە ناوماندا بێت.. بەڕێوەبەرەکە تووڕە بوو بوو، مەسەلەکە گەیشتبووە سەرەوە، پیانگوتبوو: یان دەبێت زاڤبێنی یان ژنەکەت لەوێ نەمێنێت.. ناچار ژنەکەی تەلاق دابوو.. لە دێکەی دەزانی...

چاکم لەبیرە.. زستان بوو، بەفر دەباری، ژنەکەی ڕۆیشت، لەبەر بەفر نەچووە دەرسیم، لە ڕێگای ((دەپە)) قەرەقوچانەوە، بۆ ((ئەلەزیك)) ڕۆیشت.. ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی.. ساڵی ٣٨ هات.. وەکو دەگێڕنەوە، بەڕێوەبەرەکە، بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی بکاتەوە لە دانیشتووانەکە ڕاپۆرتی خراپی دەبارەی دێکە و ناوچەکەمان نووسیبوو تاکو زیانمان پێبگەیەنێت، لە سەرووی دێکەمانەوە، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((دەشتە)).. لە نزیکییەوە ((قورتگیران))ە، لەوێدا لە زۆزانەکان بووین..

ڕۆژێك هەندێك سوارەی چەكدارمان بینی، لەلای باكوورەوە هاتن. لە چادرەكانمان دابەزین.. ئاژەڵەكانمان بۆ لەوەڕگاكان دوورخستەوە، ژنەكان بانگیان لێكردین ((نەیەنە ئەملاوە.. دوور بكەونەوە.. خۆتان بشارنەوە)) وایان پێگوتین.. سوارەكان لە زمانی ئێمە تێنەدەگەیشتن.. ئەو سەربازانە خەڵكەكەیان كۆكردەوە و بەرەو دێكەیان بردن.. ئێمە لە دوورەوە بە ترسەوە دەمانڕوانی.. ئەوان لە چاو ون بوون، ئێمەش چووینە ئەو دەشتە.. لە چادرەكان تەنیا دوو پیرێژن مابوونەوە، هەموویانیان بردبوو.. یەكێ لە پیرەژنەكان نابینا بوو، ئەوی دیكەیان كەنەفت و پیر بوو، نەیدەتوانی ڕێ بكات.. یەكێكیان ناوی ((خەجە)) بوو، ناوی ئەوی دیكەم لەبیر نەماوە..

م. چ: ئەمە كەی بوو؟ لەچی مانگێكدا ئەمە ڕووی دا؟

- كۆتایی هاوین بوو.. دەغڵ دروێنە دەكرا..

ئەو ڕۆژە ((زەینەڵ چاوش))یان هێنابوو.. زەینەڵ خەڵكی دێی ((چامورك)) بوو، لە ((قەرەشانلی))یەكانە، یانی لە ئێمەیە.. دەستیان بەستبووەوە.

دایكم ئەو ڕۆژە، گەڕابووەوە دێ.. لە زۆزانەكە قەرەقولەكان دەیبینن لێی دەپرسن ((قۆچان)) لە كوێیە؟. دەڵێت: چووە بۆ ((نازمیە)) نەگەڕاوەتەوە. پرسیاری مێردەكەی لێدەكەن... لێی دەپرسن، بۆ كوێ دەڕۆی؟ دەڵێت ((چوار هەتیوم هەیە دەچم سەردانیان دەكەم)).. ئەمجا لە مامم دەپرسن، ئەم ئافرەتە چی تۆ دەبێ؟ خێزانتە؟. مامم دەڵێت ((خێزانی براكەمە)).. دەپرسن ئەی كوا براكەت؟ دەڵێت چووە بۆ ((نازمییە))، دەڵێن، دەبڕۆ بیهێنەرەوە..

م. چ: یانی دایكت بگەڕێتەوە؟

- بەڵێ.. دوای ئەم وتووێژە، مامم دەكەوێتە شوێن دایكم، كە دەچێتە سەرگردێك دەبینێت، دایكم وا نزیكی زۆزانەكان بووەتەوە.. لەوێوە بانگی لێدەكات ((نەڕۆی وەرەوە...))، دایكم دەگەڕێتەوە.. برایەكی بچووكی هەبوو، ئەویشی لەگەڵدا دەبێت، ناوی ((عەلی)) بوو.. برا گەورەكەم، خەریكی كاسبی بوو.. تازە ژنی مارە بڕیبوو، بە تەمابووین لەو ڕۆژانەدا زەماوەندی بۆ بكەین.. ئەو ڕۆژە دەزگیرانی براكەم

لەویٚ نابیٚت و ناکەویٚتە دەستی سەربازەکان، لە زۆزان دەبیٚت.. کە دیٚتە لای چادرەکان دەبینی کەسی لیٚنەماوە، دواجار ئەو دوو پیرەژنە دەبینیٚت.. ئیٚمەش چووینە چادرەکان، دوو پیرەژنەکە وتیان ((ئەو خەڵکەیان برد بیانکوژن. ئیٚوەش مەوەستن بڕۆن. ئەگەر بیٚن ئیٚوەش دەبەن))..

کە ئەوەمان بیست ڕوومان لە دارستانەکە کرد، لەویٚدا خۆمان شاردەوە، چوار پیٚنج کەس بووین، ئەوەی لەبیرم مابیٚت یەکیٚکیان ناوی ((فیتۆزە)) بوو، ئەوی دیکە ناوی ((سەکینە)) بوو..

لەپڕ کابرایەك ناوی ((زولفی)) بوو لەو ناوەدا پەیدا بوو.. ئەم زولفییە یەکیٚك لەو پیرەژنانە پووری بوو.. وتی ((قەرەقول، ژن و منداڵی کۆکردووەتەوە هەموویان دەکوژن..)).. هەروەها ((زەینەڵی مستۆ)) هاتە لامان ژنەکەی و دوو کچی خۆی لەگەڵدا بوو.. لەویٚ بە ژنەکەی گوت: ((با ڕاکەین)) ژنەکەی وتی: ((بۆ کویٚ بڕۆین؟)). وتی: ((ڕوو لەو چیایە دەکەین، خۆمان دەشارینەوە، ئەگینا دەمانگرن و دەمانکوژن..)).

شەو تاریك داهات، لەویٚدا چاوەڕیٚمان دەکرد و دەگریایین.. لەپڕیٚکدا دایکی ((فیتۆزە)) پەیدا بوو، هات کچەکەی خۆی بردو ڕۆیشت.. منیش کەوتمە تەکمیان و چووینە دیٚکە.. لە دیٚکەدا، پشتەوەی ماڵی ((حەیدەری ملیٚ)) خەرمان بوو.. لەویٚوە چووینە ناو دارستانەکەوە و خۆمان شاردەوە.. نەمان دەویٚرا خۆمان نیشان بدەین.. بیٚجگە لە ئیٚمە خەڵکی دیکەش تاك و تەرا پەیدا بوون.. بینیمان لە قەرەقولەکانەوە چرایان داگیرساند.. کۆمەڵیٚك کەسمان لە ڕۆشناییەکەیاندا کەوتە بەرچاو بردنیان بەرەو ((دەریٚ چریٚ)).. زۆری نەبرد قەرەقولەکان گەڕانەوە. دەنگی خرمەی ناڵی ئەسپ دەهاتە گویٚ.. تومەز لەویٚدا ((قەمەر))ی مامم و خیٚزانەکەیان کوشتووە.. لەگەڵ کۆمەڵیٚك کەسی تردا، منداڵ و ژن و پیریشیان تیٚدا بوو...

((مووسا))ی ئامۆزام، لە سەربازی بوو.. عەسکەری بۆ دەوڵەت دەکرد.. ئەوکاتە بە مۆڵەت گەڕابووەوە دیٚکەیان. دەبینیٚت خیٚزانەکەیانیان بردووە ئەویش بە جلی

سەربازییەوە، یەك راست دەچێتە لایان دەڵێت: ((تەماشاکەن منیش وەکو ئێوە سەربازم بە مۆڵەت گەڕاومەتەوە.. ئێوە بۆ دایکم و باوکم و خوشکەکانی منتان هێناوە؟ چۆن دەبێت؟!

هەر کەوا دەڵێت، ئەویش باڵبەست دەکەن، لەوێدا دەڵێت: ((سەربازیمان بۆ دەوڵەت کرد و بەکارمان نەهات...))

مامم تەمەنی ٥٠ساڵ بوو، لەوێ هەموویان بە سونگی دەکوژن.. ئامۆژنم کە دەست بە کوشتارەکە دەکەن دەبوورێتەوە، دەکەوێت و دەکەوێتە ژێر لاشەکانەوە، زامدار دەبێت، بەڵام زامەکانی کاری نابن.. دوای ماوەیەك هۆشی بەبەردا دێتەوە.. گوێ هەڵدەخات، کەس نییە.. دەڕوانێت دەوروبەری هەموو مردوون.. (گەلێك جار بۆی دەگێڕاینەوە):

((تەماشام کرد لەولامانەوە دارستانێکە، بە قونەخشکێ خۆم بە دارستانەکەدا کرد، چوومە نێوان دارەکانەوە، لەناو دارستانەکەوە گوێم لە تەقەی تفەنگ دەبوو.. تومەز خەڵکی دیکەیان دەستکەوتووە و وا دەیانکوشتن..))

ئەو دەمەی قەمەری مامم و خێزانەکەی و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون دەکوژرێن سەربازەکان بە نێزە و سونگی ئەو حەمکە مرۆڤە زوو ناکوژرێن ماندوویان دەکات! هەندێکیان دەڵێن: ((ئێمە لەبەردەم لەشکرێکدا شەڕ ناکەین تا نێزە بەکاربهێنین بۆ ئێمە زەحمەتە، با ڕەشاش بەکاربهێنین..)) ئیتر خەڵکەکەیان بە گوللە دەکوشت، جار جار نەبێت، ئەویش بۆ سك هەڵتلیشاندن ئەگینا هەر بە گوللە خەڵکیان دەکوشت..

م. چ: ئەو مامەت، کە بۆ ((نازمیە)) چوو بوو، چی بەسەرهات؟

- مامەم ((حوسێن)) لە نازمییەوە دەیبەن بۆ دێی ((قل))، ئەویش لەگەڵ قوربانییەکانی تردا دەیکوژن.. ((قل)) دێیەکە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ((دوزگن باوا))وە.

م. چ: ئەو ژنە کە بە ((سونی زامدار کرا)) و چووە دارستانەکەوە، دوایی چی کرد؟

- چی بکات؟.. دەڕواتە دارستانەکەوە.. لەوێ زیارەتگایەك هەیە، دەڕواتە ئەوێندەرێ، بە رێکەوت یەکێك لەوێوە تێدەپەڕێت، بانگی لێدەکات ((برا تۆزێك ئاوم بۆ بێنە..)).. ئەویش ئاوی بۆ دەبات، دەیباتە ئاوایی، بەڵام ناچنە ناو دێکەوە، چونکی قەرەقول بیزانیبا، هەردووکیانی دەکوشت... ئامۆژنم پێی دەڵێت: ((کچەکەم ئاگادار بکەرەوە بابێتە لام، یان هەردووك رزگارمان دەبێت، یان پێکەوە دەمانکوژن..))

بەمجۆرە، کچەکەی دێتە لای، لەوێ هەفتەیەك خۆیان دەشێرنەوە، ئیتر قەرەقول پێی دەزانێ، یان لەبەر هەر هۆیەکیتر بێت، دەڕواتە ئەوبەر ڕووبار، دەچێتە گوندی ((پاش)).. ڕووبارەکەش ڕووباری ((پرە)).. ئێمە چەمی ((باسێ))ی پێدەڵێین، بە تورکی Pas Cayi))یە.. مورشیدەکانمان لەوبەر ڕووبار دادەنیشتن ((سەیدۆ))کانیان پێدەوتن، دەچێتە لای ئەوان.. شەوی کۆمەڵکوژییەکە، گەنجێك هەبوو ناوی ((یووسف ئەسلان)) دەبێت، لەناو دارستانەکە خۆی دەشارێتەوە، ئەویش هاتە لامان، ئەم ((یووسفە)) پێشتر وتم، برای سلێمان ئەفەندییە، ماڵی سلێمان هەموویان دێنن و دەیانکوژن، یەکێکیان لێ ڕزگار نابێت، لە خێزانی ((حەسەنی دەمەنی)) بەولاوە کەس نامێنێت هەموان دەکوژرێت.. ئەو باسی کۆمەڵکوژییەکەی بۆ دەکردین، من ئەمەیان لە دەمی ئەوەوە دەگێڕمەوە:

دەیگوت {باقلی، ئامۆزام، ژن و منداڵەکەی هەڵگرت و پێکەوە کەوتینە ڕێ. حەمەدی برام و خێزانەکەی کەوتبوونە بەردەستی سەربازەکان، بەڵام لای ئێمە نەبوو، لە ئێمە جیابووبوونەوە، چووبوونە دێی ((گەرە)). خدری براشم هەر لە دێکەی خۆیان مابووەوە لەوێوە چاوی بە ماڵەکانمانەوە دەبوو.. ژنەکە و منداڵە وردەکانی دوورخستبووەوە، بەڵام خۆی لەو دەوروبەرەدا بوو، پێیانی گوتبوو: ئێوە بڕۆن من لێرە دەمێنمەوە، کە خەڵکەکەیان کوشت با منیش بکوژن، دوای ئەوان ژیانم بۆ چییە)) ئێمە جلی نوێن و لێفە و دۆشەکمان زۆر بوو، هەموو ئەو شت و مەکانەمان لە سووریا کڕیبوو.. کە سەربازەکان لەو ناوە دەڕۆین، دەهات بزانێت چی ماوە و چی

براوە.. سەربازەکان زۆریان لێبردبوو.. یەکێك لە هاوسێکانمان پێی دەڵێت، هەستیان کردووە تۆ لێرەیت، برۆ مەمێنە.. زۆری پێناچێت کۆمەڵێك سەرباز بۆ گرتن دێن.. بەڵام ئەو چاپوکانە هەڵدێت و خۆی قورتار دەکات...

ئێمە چووینە زۆزانەکان، دەبینین، ئەو دوو پیرە ژنە هێشتا لەوێدان، لێمان پرسین: ((کەس هاتووەتە ئەم ناوە؟)) وتیان، نەخێر کەس نەهاتووە.. تەنیا ((زلفیێ)) لەگەڵ منداڵەکانیدا هاتوون، وا لەسەر ئەو کانییەی خوارەوە دانیشتوون.. چووینە لای ((زولفیێ))، وتی: لە دێکە کەس نەما، هەموو کوژران.. با ئێمەش لێرە نەمێنین و برۆین، دەچینە ((پوغوسیێ کەمۆ))، خوشکێکی سلێمان ئەفەندی ناوی ((ئینجە)) بوو لەویێ مێردی کردبوو، شووی بە کوڕی (مەمیێ وەلی) کردبوو.. ئەو پیاوە ((دەنگ بێژ)) بوو.. چووینە ماڵی ((ئینجی))، ئینجی بۆی باس کردین کەوا لە ((بێرەسك)) خەڵکێکی زۆر کۆم کوژی کراوە.. بەڵام نەیدەزانی کوژراوەکان کێن... ئامۆزاکەم، حاڵی ئێمەشی بۆ باسکرد: ((هاتووین.. زولفیمان لەگەڵدایە ئەگەر دەتوانیت هەندێك خواردنمان بدەریێ..)) ئینجە، هەندێك نانی بۆ ئامادەکردین وتی: تا بەیانی ئیدارە بکەن، دوای ئەوە وەرنە ئێرە، نانتان بۆ ئامادە دەکەم.. ئێستا هەر ئەوەندەمان بۆ پەیدا کرا..)). دوای دوو ڕۆژ گەڕاینەوە لای ئینجی، بەڵام حاڵی زۆر پەرێشان بوو، هەواڵی کوشتنی براکەیان پێدابوو... ئەمجا، ڕومان لە لایەکی دیکە کرد.. چووینە شوێنێکی چەپ، کانی و ئاوێکی لێبوو، لەژێر دارگوێزەکانداماینەوە. نزیکەی هەفتەیەك بەو جۆرەمان گوزەراند.. شەوێکیان زولفیێ و ئامۆزاکەم چوونە ((پوغوس)) تا بزانن چ باسە.. لە یەکێك دەپرسن، دەڵێت: ((لە نازمییەوە خەڵکانیك هاتوون دەڵێن لێبوردن دەرچووە.. قەتلوعام وەستاوە!! خەڵکی دەگەڕێنەوە دێکانی خۆیان.. ئێوەش بگەڕێنەوە.. بەڵام بڕوایان نایەت.. بەڵام، سوێند دەخۆن کەوایە و هیچ نەماوەو مەترسن، بگەڕێنەوە ماڵی خۆتان.. وایان پێدەڵێن:

بۆ بەیانییەکەی هەستاین، بەرەو ((تاغگین)) ڕۆیشتین، لەوێوە بەرەو خوار بووینەوە، چووینە ئاوایی ((بۆڵچییە))، لەویٚ ژنێکمان بینی، باسی خۆمانمان بۆ کرد، ژنە وتی: مەترسن، لێبوردن دەرچووە، بکەونە ڕیٚ و بگەڕێنەوە دێکەی خۆتان..

ڕاست ڕوویان کردە زۆزانەکانی لای خۆمان، لەویٚ نە ئاژەڵ مابوو نە شت و مەکەکان، هەموو شتێك وێران کرابوو، لەوێشەوە چووینە ئاوایی، لە پێشدا نەچووینە ناو ئاواییەوە.. زولفیٚ وتی من دەڕۆم، سۆراخی دایکم و باوکم دەکەم و دەگەڕێمەوە.. هاتەوە.. دایك و باوکی کوژرابوون... سەربازەکان ئەو دوو پیرە بەتەمەنانەشیان کوشتبوو.. ڕاست بوو لێبوردن دەرچوو بوو.. چووینە ماڵی خۆمان.. بەڵام هەموو شتێکمانیان بە تاڵان بردبوو.

ئەوەی لە ٣٨ بەسەر ئێمەدا هات ئەوە بەشێکی بوو خەڵکێکی بیٚ گوناه قەتلوعام کران.. هەندێك خێزان کەسیان لیٚ دەرنەچوو...

## لەناو ئەو هەموو زاڵمانەشدا پیاوی بە بەزەیی هەبوو

مونزور چەم: خۆت بناسێنە.. ناوتان، دێکەتان؟

ئوسێن: من ناوم ئوسێنە، ئوسێنی ئیڤرایمی.. ئەم برادەرەشمە ناوی مستەفایە. مستەفایێ سێدالیەییێ زەکە. دێکەمان ناوی ((ئاموتقە))یە دێکەی ئەمانیش ((قۆزا سەید خان))ە،.. دێکەی ئێمە لە نزیکی (بوغازی علی)یە سەر بە هۆزی ((قۆچان-قۆزان-یان، پۆچۆ/قۆزۆ))ین.

م. چ: دەمەوێ بپرسم.. لای ئێمە کەسێك بەناوی باوك یان باپیریەوە دەناسرێت و بانگ دەکرێت، دەبینم باوکت بە ((سێدالیە زەکە)) ناسراوە بۆ؟ زەکە، دایکتە، یان ژنێکی دیکەیە؟.

مستەفا: زەکە، ناوی دایکمە، باوکم زوو مردووە، داپیرەم بەخێوی کردووە، بۆیە ناوی باوکم لەگەڵ ناوی داکیدا هاتووە.. باپیرەم کوژراوە. کوشتنەکەی بەمجۆرە بووە: رۆژێکیان باپیرم، باوکم و چەند کەسێکی دیکەی لەلا دەبن لە دێی ((باراسور)) دەبنە میوان.. ((باراسور)) لە دامێنی چیای ((مونزور)) ە، کە دەکەوێتە سەر رووبارەکەوە، نازانم لەبەرچی شکاتیان لێکردبوو، یەکێك لە ناسیاوەکانی پێی دەڵێت: تاکو سەربازەکان نەهاتوون برۆ لێرە مەمێنە.. باپیرەم و ئەوانەی لەگەڵدا دەبن دێکە بەجێ دێڵن، زۆر دوو ناکەونەوە، سەربازەکان دەگەن، سەربازەکان میلیشیای تورکیان لەگەڵدا دەبێت..

م. چ: سەربازەکان بۆ دەیانویست باپیرت بگرن؟

- دەزانیت، نێوان دەرسیمییەکان و دەوڵەت هەمیشە باش نەبووە بە هەرحاڵ شکاتیان لێکردبوو ((ئەمانە رێگرن))، دەوڵەتیش لە خوای دەویست.. گەورەی ئەو هێزە بەرێوەبەری ((ناحیەکە)) بوو، ناوی ((نادر)) دەبێت.. نیشان شکێنێکی بەناوبانگ دەبێت.. کە دەزانن ئەویان لەگەڵە، باپیرم دەڵێت: خۆتانی لێ بپارێزن..،

خۆیان مات دەکەن، بەڵام کە بۆ جارێ سەری هەڵدەبڕێت. تومەز دەستی لە کاردا دەبێت یەکەم گوللە لەسەری دەدات، هەر دەستبەجێ لەوێدا دەمرێت..

م. چ: ئەم ڕووداوە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بوو؟ یان لەسەردەمی مستەفا کەمال؟

ئوسێن: بەر لە مستەفا کەمال دەبێت.. سەردەمی عوسمانییەکان بوو.

م. چ: ساڵی ١٩٣٨ز، تۆ چەند ساڵان بوویت؟ چی ئەو رۆژگارانەت لەبیرە؟

مستەفا: من ئەو دەمە ٤-٥ ساڵان بووم، ئەوەی لەو دەمە ڕوویاندا، کەمیانم لەیادە، بەڵام ئەوەی بەسەر خۆماندا هاتوون لەبیرم دەرناچن.. گەورەکانمانیش هەمیشە دەیگێڕنەوە.

م. چ: دە فەرموو بیگێڕەوە؟

- لە کتێبەکەی تۆدا {پێ بکەنە دەرسیم} ((ڕۆمانێکە لە سێ بەرگدا، لە نووسنی مونزور چەم، لەبارەی کۆمەڵکوژییەکەی دەرسیمەوەیە-ئەحمەد-)).. باسی عەشیرەتەکەی ئێمەت لەو ڕۆمانەدا کردووە.. پیاوانی چەکداری هۆزەکەمان هێرشیان کردووەتە سەر قەرەقوڵی دێی ((ئاموتقە)).. سەرباز لە ((هۆزات))ەوە هێرش دێنێت، کە ئەو هێزە دەگەن، ئێمە دێکانمان چۆڵکرد.. چووینەتە ((عەلی بوغاز))، لەوێ لە ئەشکەوتەکاندا، لەناو دارستانەکاندا خۆمان شاردووەتەوە، ژمارەی سەربازەکان یەکجار زۆر دەبێت، توانیویانە عەلی بوغاز و کێوی مۆری Yilanli dag ((چیای ماران)) و چیای مونزور داگیر بکەن، لەو هێرشەدا، دوو کچی منداڵی خاڵوانم دەست سەربازەکان دەکەون و دەیانبەن، یەکێکیان ناوی ((شەمسە)) دەبێت، ناوی ئەوەی تریانم لەبیر نییە.. شەمسە، کچی ((ئاغا))ی خاڵۆمە. ئەوی دیکەیان کچی زەینەڵە.. شەمسە هەر لەناو بێشکە دایان نابوو بۆ من بێت.. ئەو دوو کچە بۆ کوێیان بردن، چییان لێهات، ئێستەش نەمانزانی.. ئێمە لەو بڕوایەداین، کوژراون.. زۆر گەڕاین، شوێن نەمان نەگەڕێین بێ سوود بوو... لەم کاتەدا کۆمەڵە کەسێکی لای ئێمە خۆیان تەسلیم دەکەن.. سەربازەکان بێ یەك و دوو دەست و پێیانیان دەبەستنەوەو دەیانبەن بۆ

((قەرەولان-تورکەکان کردوویانە بە قەرەئۆغلان Kara oglan- تا بیانکوژن.. باپیرم ئەوکاتە لە ((پولور)) دەبێت ٣٠ لیرەی زێڕ بە بەرتیل دەداتە سەربازەکان و ڕزگاریان دەکات، ئەگەر وای نەکردبا ئەو ٣٠ کەسە لەوێدا دەکوژران.. بەو شێوەیە ماوەیەك لە ئەشکەوت و دارستانەکاندا ماینەوە، بێ گومان زۆر سەغڵەت بووین، هەموو لایەکمان سەرباز گرتبووی، دەترساین.

م. چ: لەوێ چیتان دەخوارد ؟

- بەزۆری گژوگیای ئەو دەشتانە بوو.. فرسەتمان دەستدەکەوت لەو ناوانە گژوگیامان کۆدەکردەوە و دەمانخوارد.. ئەوەی نەدەخوراش دەمانخوارد.. بەڵام قەت تێر نەدەبووین.. ڕۆژێکیان بۆ شوێنێك دەڕۆیشتین، لەپڕ کۆمەڵێك سەربازمان لێ پەیدا بوو، من بە کۆڵی باوکمەوە بووم، ئەوکاتە باوکم تووشی ((تەراخوما)) بوو بوو، باش نەیدەدی. کە سەربازەکان لە پڕێکدا کەوتنە بەرچاو، منی دانا و خۆی ڕایکرد. مامم لە دواوە بوو لە باوەشی گرتم و خزاینە دۆڵێکەوە و ڕامان کرد.. بەڵام دواجار کەوتینە بەردەستیان نەمانیان کوشت (تەرحیل)یان کردین.. بێ گومان، کە کەسانێکیان ((تەرحیل)) دەکرد، ئیتر کەس ئاگایان لێ نەدەما، کێ ماوە و کێ نەماوە..

باوکم ئامۆزایەکی هەبوو، ناوی ((سەی جافر)) بوو، کابرایەکی ئازا بوو.. لە ((عەلی بوغاز)) سەرباز چەکی لێ ڕادەکێشن و تەقەی لێدەکەن، گوللەیەکی بەردەکەوێت، بەو زامدارییەوە ڕادەکات.. دەچێتە چیاکان و خۆی خۆی تیمار دەکات و چاکیش دەبێتەوە.. برایەکی دەبێت ناوی ((حەسەن ئاغا)) دەبێت، ئەمیش ڕۆژێك لە ((کێوی مۆری)) دەکەوێتە شەڕ، سەربازەکان خۆیان ناگرن و دەکشێنەوە.. یەکێك لە سەربازەکان هەر لە سەنگەرەکەی خۆی دەرناچێت، چاوەڕێی فرسەتی لێدەکات، حەسەن ئاغا، دەکەوێتە دوویان، سەربازەکە لە دواوە تەقەی لێدەکات و لەوێدا دەیکوژێت... هەر لەو ناوانەدا، دانیشتووانی دێکەمان، دەچنە چیای ((مونزور))، سەرباز لەو ناوەدا دەبن، سەربازەکان ڕێگای گەڕانەوەیان لێدەگرن، لەملایانەوە خەرەندێك دەبێت، زۆر بەرز، هیچ چارەیەك نادۆزنەوە لەوەی زیاتر لەوێوە بچنە خوارەوە. لەنێو خۆیاندا دەڵێن،

دەستی سەربازەکان بکەوین دەمانکوژن، وا چاکە بڕۆینە خوارەوە، بەو جۆرە ڕوو لە خەرەندەکە دەکەن، بە یارمەتی هەموو لایەکیانەوە بە سەلامەتی دەچنە خوارەوە.. ئەو دەمە نزیکەی ۸۰ کەسێك بوونە.. یەك دوانیان دەکەوێتە خوارەوە و دەمرێت ئەو دوایی ڕزگاریان دەبێت..

م. چ: هۆزەکەی ئێوە ساڵی ۱۹۳۷ز شەڕیان لەگەڵ دەوڵەتدا کردبوو؟

- نەخێر.. شەڕیان لەگەڵ دەوڵەتدا نەکرد.. ڕاستیت دەوێت، ساڵی ۱۹۳۷ز، هۆزەکەمان و قەرەبالییەکان و فەراتەکان، پێکەوە ڕێکدەکەون و قسە لەسەر شەڕکردن دەکەن.. بەڵام دواجار، هەردوولایان لەسەر قسەی خۆیان نامێننەوە دەچنە پاڵ حکوومەت.. بەڵام خزمەتکردنی ئەو دوو عەشیرەتە بۆ دەوڵەت دادی نەدان.. ساڵی ۱۹۳۸ز هەردوولایان زیانێکی زۆریان لێکەوت، لە ئێمە زۆرتریان لێ کوژرا لەلایەن دەوڵەتەوە!.. بۆ نموونە: مەمەدالی ئاغا و جەمشید ئاغا و ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون قەلوعام کران.. لە ((خۆزات)) دێیەك هەیە پێی دەڵێن ((تاجقراگە))، ساڵی ۱۹۳۸ز لەناکاودا سەرباز هێرشی بۆ دەبات.. کۆیان دەکەنەوە، دواجار ژنەکان لە پیاوەکان جیادەکەنەوە.. لە پایین دێکەوە دارگوێزێك دەبێت، پیاوەکان بۆ ژێر ئەو دارە دەبەن و بەر گوللەیان دەدەن، ((موسلم)) ناوێك و دوو کەسی دیکە دەتوانن هەڵبێن، ئەو کابرایە گێڕابوویەوە: ((ئێمەیان ڕیزکرد، بە پەت بەیەکەوەیان بەستینەوە، تەقە دەستی پێکرد، بە کۆمەڵ خۆمان غل کردەوە، لەو دەمەدا سێ کەسمان توانیمان پەتەکەی پامان بکەینەوە و ڕامانکرد و ڕزگارمان بوو.. ژن و منداڵیشیان لە شوێنێکی تر بەر گوللە دابوو... لەناو ئەوانیشدا ژنێك بە سووکی بریندار دەبێت، دواجار کە سەربازەکان ڕۆیشتبوون ژنەکە هەڵسابوو و خۆی گەیاندبووە جێگایەکی ئەمین.. ئەو ژنە مێردەکەی لەگەڵ کۆمەڵی پیاوەکاندا کوژرا..

ئوسێن: کە دواجار، بەو ڕێگایەدا دەچووین بۆ ((هۆزات)) لەژێر ئەو دارگوێزەدا ئێسکی مرۆڤ بە کۆمەڵ لەو ناوەدا کەوتبوو.. من خۆم چەندین جار ئەو ئێسك و پرووسکانەم بینیوە..

مستەفا: من ئەم ڕووداوەم لە دەمی کابرایەکەوە بیستووە دەیگوت:

((ئێمەیان ڕیز کرد، بەستیانینەوە، بەڵام بەرە بەرە دەستمان کردەوە.. بەر لەوەی بڵێن ((Ares)) یانی-تەقە بکەن- دەستم کردەوە، لەپڕ ڕامکرد، کە من ڕامکرد ڕەشاش دەستی پێکرد.. ئێمە چوار-پێنج کەس بووین ڕامانکرد.. بەڵام تەنیا من گوللەم بەر نەکەوت، ئەوانی تر کەوتن...

م. چ: ئەو چۆن بەری نەکەوت؟

- دەیگوت، شیوێك نزیکمان بوو، خۆم هەڵدایە ناو زەل و قامیشەڵانێکەوە، ئەو شوێنە پێی دەڵێن ((زوخوری))..

ئەو ژنەش کە ڕزگاری بوو، ناوی ((ئەردیفە)) بوو.. کە تەقەیان لێدەکەن، دەکەوێتە ژێر لاشەکانەوە و سووکیش بریندار دەبێت.. دوای ماوەیەك دێتەوە سەر خۆی، هەڵدەستێت تەماشا دەکات هەموو کوژراون.. لەوێ خۆی دەردەکات و دەڕوات.. دەڕواتە دێی ((براشتیغە)) لەوێ دەمێنێتەوە، کەسوکاری هەموو کوژرابوون، شوو بە یەکێك لە کەس و کارەکانی ((بەرتەل)) ئاغا دەکات.. ((براشتیغە)) ئێستا لە نزیکی ((ئاختۆخە))یە.. ئەویش دێی خزمانی ئێمەن.. ((ئەردیفە)) تا ئەم نزیکانەش لە ژیاندا مابوو..

ئێمەش هەر لەو چیایانە ماینەوە، برایەکی لە خۆم بچووکترم هەبوو لە برساندا لەو چیایە مرد.. ئێمەش سەرگەردان لەو ناوانەدا دەسووڕاینەوە.. ڕۆژێك لەپڕ، خالۆم ((زەینەل)) پەیدا بوو.. تومەز حکوومەت ناردوویەتی: بڕۆ لەگەڵ خەڵکەکەدا قسە بکە، با بێن خۆیان تەسلیم بکەن.. نایانکوژین، بەڵام ((تەرحیل))یان دەکەین.. ئیتر ئەوەیان بگرتایە تەرحیلیان دەکرد قەتلوعام ڕاگیرا.. ئێمەش چووین خۆمان بەدەستەوە دا.

بۆ ((ئەلەزیك)) ڕایان گواستینەوە.. ئەوەی لەوێ لەبیرم دەرناچێت، گەرماوەکەی بوو.. بردینانین بۆ گەرماوێك.. بەر لەوەی بمانبەن بۆ گەرماوەکە، سەرو ڕیشی پیاوەکانیان تاشی.. هەموویان بێ قژ و بێ سمێڵ.. دەزانن، پیاوی کورد، عەلەویش بێ

تەراشکردنی ڕیش و سمێڵی پێ ناخۆشە.. ئافرەتیش حەز ناکات قژی لە بندا ببڕن.. ئێمە ((عەلەوی))ن نابێ پیاو سمێڵی تەراش بکات.. بێ گومان ئێستا جۆرێکی کەیە بۆ ئەو ڕۆژگارانە سەخت بوو، ئێستا ئەو نەریتە لەبیرکراوە زۆریش گرنگ نییە گەر یەکێك سمێڵ بتاشێت.. ژنەکان کە قژیان دەبڕین هەر دەگریان، هەندێکیش هەر پێدەکەنین.. لەم ماوەیەدا دایکم لێ ون بوو، چونکی ئەو هەموو ژنە بێ قژانە لە یەك دەچوون. نەدەناسرانەوە، گریان، شێت ئاسا بۆ دایکم دەگەڕام، دواجار لە قوژبنێکدا بینیمەوە، لەگەڵ کچەکەی مامەیدا بوون.. هەردووکیان دانیشتبوون دەگریان.. دواجار بە شەمەندەفەر بۆ ((مانیسە))یان بردین، مامەشم لەگەڵدا بوو، باوکم، پێشتر بۆ ((بورصە))یان ناردبوو..

دێیەك هەیە ناوی ((ئەرموت))ە، لەو دێیە دایان نابوو.. ئاگامان لە یەك نەبوو.. لە یەك دابڕابووین.. دواجار زانیمان لە ((بورصە))یە.. داوای سەردانیمان کرد، بەڵام ڕێگایان پێنەداین.. دوای ماوەیەك، باوکم بە نهێنی هاتە لامان، بەڵام هەر زوو دەوڵەت پێیزانی و گەڕاندییەوە.. مامم لای باوکم بوو، بەڵام خێزانەکەی بۆ ((چروم)) تەرحیل کرابوو، دەوڵەت وای گەرەك بوو، دەیویست خێزان لە یەکتر دابڕێت..

م. چ: لە ((مانیسە)) چیتان دەکرد؟

– کە چووینە ئەوێ ژوورێکیان پێداین.. خەڵکی دێکە زۆر باش بوون لەگەڵماندا. پێویستییەکانمانیان جێبەجێ دەکرد.. جاف لە واسکیڤانەوە بۆ ئێرەیان تەرحیل کردبوو.. جاف، ئەو دەمە گەنج بوو..

م. چ: ئوسێن تۆ چی دەڵێیت؟ ساڵی ١٩٣٨ز چیت بینی؟ چیتان بەسەرهات؟

ئوسێن: ئەوی من دەمەوێت بیلێم، ئێوە لە ڕۆمانی ((پێبکەنە دەرسیم))دا نووسیوتانە... کە سەربازەکان هاتنە ((عەلی بوغاز)) ئێمەش وەکو خەڵکانی تر ماڵ و حاڵمان بەجێهێشت.. سەید خان ئاغا و هەندێك خێزانی تر لەوێ نەمان و دوورکەوتنەوە.. باوك و دایکیشم لەگەڵ ئەواندا بوون... بەدەم ڕێگاشەوە قونە شەڕیان دەکرد.. دەڕۆین و هەندێك لە چەکدارەکان پارێزگاری ژن و منداڵەکانیان دەکرد.. لەو

بگرەو بەردەیەدا گەلێك كەس كەوتبوونە رووبار و چەمەكانەوە.. هەندێك، منداڵی خۆی بەجێهێشت.. یەكێك لەوانە خێزانەكەی ((ئاغا)) بوو-ئاغا.. ناوی كەسێكە ناچار دەبێت منداڵەكەی بەجێ دەهێڵێت.. من ئەوكاتە لە باوەشی دیكمدا دەبم، لەبەر ئەوەی منداڵێكی دیكەشی دەبێت، دەكەوێتە سەر ئەوەی یەكێكمان بەجێ بهێڵێت.. لە پێشدا، من لەناو كۆمەڵتەیە گژوگیا لەسەر پشت بەجێ دێڵێت و دەڕوات.. كەمێك دەڕوات خۆی ناگرێت و دەگەڕێتەوە، دووبارە لە باوەشم دەگرێت، بەجیاتی من ((خانێ))ی خوشكم لە شوێنەكەی من دادەنێت، خانێ، لەمن گەورەتر دەبێت.. خانێ دەگریت و دەڵێت: دایە جێم مەهێڵە.. بۆ لەگەڵ خۆتدا نامبەیت؟.. كەوا دەڵێت هەمدیس خۆی ناگرێت، دەگەڕێتەوە.. ئەمجارە من دادەنێت.. ئێوارە، كە باوكم دێتەوە، دەڕوانێت، من لەو ماوەدا نیم.. دەپرسێت: حوسە كوا؟.. دایكم دەست بە گریان دەكات.. ((نەمتوانی هەردووكیان هەڵگرم، ئەوم بەجێهێشت..)).. شوێنەكەی پێ دەڵێت، باوكم لەگەڵ چەند كەسێكدا، بە پەلە دێن.. دەمبینێتەوە.. هەر لەو ناوانەدا، لاشەی ((قارەمان)) دەدۆزنەوە، لەوێدا چاڵێكی بۆ دەكەن و بە جلەكانییەوە دەینێژن...

م. چ: دایكت ناوی چی بوو..؟

- ناوی (بەسێ) بوو..

جارێكیان، ژن و منداڵێكی زۆرمان لەگەڵدا بوو، لەسەر ئاوێك پشوومان دەدا دوو منداڵ دەچنە قەراغ ئاوەكە و یاری دەكەن.. كۆمەڵێك سەرباز لەسەر ئاوەكە دەبن، یەكێكیان دێت و لە منداڵەكان دەدات.. یوزباشییەكەیان چاوی لێ دەبێت، بەڕاكردن دەچێت بۆ لای سەربازەكە و دوو منداڵەكە.. زۆر لە سەربازەكە تووڕە دەبێت و دواجار دەست و پلی منداڵەكان لە ئاوەكە دەشوات و بەڕێیان دەكات.. یانی لەناو ئەو زاڵمانەدا، تێیاندا هەبوو بەزەیی و ڕەحمی هەبێت..

م. چ: ئێوەشیان ((تەرحیل)) كرد؟

- بەڵێ.. ئێمەیان بۆ ((سوما)) تەرحیل كرد، ئەو دێیە ئێمەی لێ بووین ناوی ((یونجالی)) بوو.

## {دوای ((۳۸))یش زوڵم هەر بەردەوام هەبوو}

م. چ: لە پێشدا ناوتان چییە؟

ی. ت*: ناوم ((ی. ت))یە.

م. چ: خەڵکی کام ئاواییت؟

- باپیرم لە دێی ((قشڵە)) دادەنیشت. لە کۆن ئەوێ ((ناحیە)) بووە، دواجار مەرکەز لەوێ نەماوە و بۆ ((زەرانیگە)) گوێزراوەتەوە، لەوێشەوە جارێکی تر بۆ ((پولور)) گوێزراوەتەوە. ((پولور)) ناوێکی دیکەشی هەیە ((واجیخە))ی پێدەڵێن، دەوڵەت ئەم ناوەی گۆڕی و کردی بە ((ئۆڤاجگ))، ناوە فەرمییەکەی ئاوایە.. ئێمە لە عەشیرەتی ((پەزگەوران))ین..

م. چ: ناوی باوکت و باپیرت؟

- باپیرم ناوی (مەحموود))ە، مەحموود ئاغا.. باوکی باپیرم ((وەلی)) ناوبووە. باوکی وەلی ناوی ((لازێ تۆپزی)) بووە.. بە تورکی-Topozoglu- و.. باوکم سەید ئاغای ناوە.. ئاغا بووە.. ئێمە لە بنەڕەتدا ((مالاٚتیایین))، کە لە مەلاتیا دەردەچێت دەڕواتە دێریك، لە نێوان دێریك و پولور، دێیەك هەبوو ناوی بودیگ بووە.. نازانم دوای چەندێك هەندێك لە کەسەکانمان لە بودیك دەڕۆن و دەچنە ((میرجان-مەرجان-)) هەندێکی تریان لەوێش نامێنن، لەکاتی ئەم لەیەك جیابوونەوەیەدا، باوکی باپیرم دێتە ئەو شوێنە کە پێی دەڵێن ((قشڵە)) و دواتریش دەڕواتە دێی ((مەرغۆ)).. مامەم ئیبراهیم، بەر لە ساڵی ۱۹۳۸ز لە ((خەرپیت-ئەلدزیگ-)) دەبێتە ئەندامی ئەنجوومەن.. لەو ڕۆژانەی لەشکر و سەرباز لە هەموو لایەکەوە دەورەی دەرسیم دەدەن، ((ئیبراهیم ئاغا)) لە ئەستەنبۆڵ دەبێت، بۆ چارەی نەخۆشییەکەی لەوێ دەبێت. پێشتر دومەڵێك لە ڕووی دەردەچێت، بەلاٚم ئەو زامەی تەشەنە دەکات و لێی

---

* لەسەر داوای خۆی، تەنیا دوو پیت لەناوی خۆی و باوکی دەنووسین.

دەکاتە شێرپەنجە، هەواڵی ئەو هێرشەی پێ دەدەن، بۆ ئەم مەسەلەیە ((باراسورییەکان)) دێت،ە لای، پێی دەڵێن ((برایم ئاغا تۆ لێرە بە، ئێمە دەڕۆین ئاژەڵ و پەزەکانمان دێنین.. ((باراسور)) لە چیای مونزورە بەو دیو ((ئەرزنجان))ەوە، دێیەکە دەکەوێتە سەرچاوەی ڕووباری ((قەرەصو))وە هەرچەندە ناوی دێکە کوردییە، بەڵام دانیشتووانەکەی تورکن، هەر لە کۆنەوە نێوانمان لەگەڵیاندا باش بووە، ئەو داڵدەدانەیان بۆ ئێمە بۆ ئەو پێوەندییە کۆنە دەگەڕێتەوە.. لەم دواییانەدا وەکو دێکانی تر کە ناوی کوردیان هەبوو، دەوڵەت ناوەکەی گۆڕی، ئێستا ناوی ((Caybagi))یە.

م. چ: دواجار؟

- مامەم، بەمە ڕازی نابێت، دەڵێت: هاوسێ و خەڵکی دەوروبەرم بکوژرێن و نەمێنن و ماڵ و منداڵەکەی من قورتاریان بێت لە کەڵکی چی دێت؟ ڕاناوەستم دەڕۆم. دەگەڕێتەوە دەرسیم. نێوانی لەگەڵ مەئموور و سەرلەشکردا زۆر باش دەبێت، کەمێکیش پشت بەوان دەبەستێت.

م. چ: باپیرت ئەو کاتە مابوو؟

- نەخێر، باپیرم بەدەستی یەکێك لە خزمانی خۆمان کوژرابوو.. ئەم مامەم کە باسی دەکەم ئەوکاتە کە باپیرم دەکوژرێت ٧-٨ ساڵان دەبێت... والییەك هەبوو، ناوی ((عەلی جەمال)) دەبێت.. بەر لە ساڵی ١٩٣٨ ((پارێزگار)) بووە ((عەلی جەمال)) لە ((ئەلازیك)) دادەنیشت، مامم لەگەڵ ئەو والیەدا نێوانیان باش دەبێت، بەڵام سەرەڕای ئەمەش باوکیان ئازاردا.. مامەیەکی لەو بچووکترم هەبوو، وتی ((با ڕابکەین)) مامم ((برایم)) ڕازی نەبوو.. ((بۆ، لەبەرچی ڕابکەین؟ چیمان کردووە؟ ئێمە ڕاکەین منداڵەکانمان دەکوژن)) ئاوای پێ دەڵێت.. باش لەبیرم نەماوە، هاوینەکەی ٣٨، ڕۆژێکیان سەربازێکی زۆر هاتن، لە تەرەفی ((قوچانەوە)) هاتن، یانی لە ((عەلی بوغازە))وە هاتن.. ئاژەڵێکی زۆریان پێبوو.. تومەز مەڕ و ئاژەڵی قۆچانییەکانە و بە تاڵان هێنابوویان.. بەشێك لە سەربازەکان هاتنە ناو دێکەمانەوە.

دێکەمان لەسەر ڕێگایاندا بوو.. کە دێنە دێکەوە، ((مەمێ کەوی)) بە دەنگی بەرز بانگ لە ((زینۆ)) ناوێك دەکات: ئەوە چییە؟ چی قەوماوە؟.. زینۆ دەڵێت ((سەربازەکان وا کۆمان دەکەنەوە.. دەیویست پێی بڵێ: سەرباز هاتووە و بۆتان دەکرێ دەرچن و بڕۆن... بەڵام خەڵکەکە تێناگەن.. زۆری نەبرد گەماڵەکەمان دەستی بە وەڕین کرد، تومەز وا لەبەر دەرگادان.. کە مەمۆ ئەو هەموو سەربازە دەبینێت پێیان دەڵێت: ((نەچنە ناو گەنمە شامییەکەمەوە وێرانی مەکەن..!)) یەکێك دەڵێت: ((ئەم سەگە خەمی خۆی نییە، خەمی مەزراکەیەتی...)) بێ گومان ئەوە بە زمانی تورکی دەڵێ.. بەڵام مەمێ خۆی دەدزێتەوەو هەڵدێت.. باوکیشم بەلایەکدا دەڕوات.. هەندێکیان باوکم دەبینن و دەیگرن.. وایانزانی بوو باوکم پێی گوتوون نەڕۆنە ناو مەزراکەمەوە.. لەسەر ئەوە زۆریان لێدا... ئێمە دەستمان بە گریان کرد، دوو گەماڵمان هەبوو، سوپایەکە تەقەی لێکردبوون و لەبەر دەرگا گەماڵەکانی کوشت..

((حسێن))ێکی تر هاوسێمان بوو، ئێمە هەر بە ((بۆزۆ)) بانگمان دەکرد.. خەڵکی دەوروبەری ئەرزنجان بوو، کە باوکمیان گرت، ئەو چووە ناو تەوێڵەکەوەو خۆی شاردەوە.. لەو کاتەدا هەر ئازاری باوکم دەدەن، سەر دەردێنێت بزانێت چییان لێهات، دەیبینن، دەچن ئەویش دێنن..

هەندێك لە سەربازەکان بە بەر چاومانەوە، کەوتنە ناو ماڵەکەمان و دەستیان کردە شتومەك بردن.. ئەمجا، هەموومانیان بردە لای خەرمانەکان، لەگەڵ خێزانێکدا نێوانمان زۆر باش بوو ناوی ((سەید ڕەزا)) بوو.. ئەمە بێ گومان ئەو سەید ڕەزایە نییە کە دواجار ئیعدامیان کرد... ئەم ((سەید ڕەزایە)) یەکێك بوو لە ((دەروێشی جەمالییەکان)) دەمەوێت بڵێم ئەویشمان لە تەکدا بوو.. دوای ئەوە پیاوەکانیان جیاکردەوە و بردنیان.. دایکم لە ترسا بە براکەمی گوت: تۆش لەگەڵیاندا بڕۆ.. باوکم بە تووڕە بوونەوە تەماشایەکی دایکمی کرد.. ((ئەوەچی دەڵێیێت، بۆ دەتەوەێت بیکوژن..؟!)).

لەو کاتانەدا، تەماشامان کرد، ئەفسەرێك لەلای خەرمانەکانەوە هاتە لامان وتی: ((ئەوە شتومەکی ئێوەیە هەڵیگرنەوە!!)) کەوای دەگوت، چاوی پڕ بوو لە ئاو.. خۆی نەگرت فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە!.. ئێمە سەرمان سوڕما...

م. چ: بۆچی شتومەکەکانی ئێوەی دایەوە؟

- نازانم.. ئەو گریانەی نیشانەی ئەوە بوو، حەزی بەو کارە نەکردووە.. بەڵام دیارە دەسەڵاتی نەبووە.. هەر هەمان ئەو ئەفسەرە وتبووی: ((ئەوەی دەفتەری نفوسی هەبێت هیچی لێ ناکەن.. بەڵام ئەوەی نەیبێت دەیکوژن...)).

ئەو پیاوانەی کۆیان کردبوونەوە، بۆ ((قشڵە))یان بردن، ئەو شەوە لەوێ دەبن.. سەید ڕەزای هاوسێمان، خۆی شاردبووەوە کە سەربازەکان ڕۆیشتن دەگەڕێتەوە، خۆی بە حەوشەماندا دەکات ((هاتووم منداڵەکانم دەبەم..)) دایکم، لێی دەپاڕێتەوە نەڕوات.. ((لە ناوماندا تەنیا پیاوێك مابێتەوە تۆی.. تۆش دەڕۆیت تەنیا دەمێنینەوە.. سەربازەکان دێن دەمانکوژن ئەگەر لێرە بیت هەرنەبێ تۆ شارەزای ڕێگا و بانەکەیت پێکەوە دەڕۆین..)) یەکێك لە کوڕەکانی دەڵێت، دەبێ بڕۆین.. ئەوی تریان حەزی نەدەکرد بڕۆن.. ئەمیان لێی تووڕە دەبێت دەڵێت: ((بڕۆ ژوورەوە منداڵەکان بێنە دەڕۆین..)) کە دەچێتە ژوورەوە، دەرگا لەخۆی کلۆم دەدا.. ژوورەکەش ژووری ئێمە بوو هەڵبەت سەید ڕەزا دەیتوانی دەرگاکە بشکێنێت، بەڵام دایکم دەڵێت: ((ئەگەر دەرگاکەمان بشکێنیت بە سەید ئاغا دەڵێم..)) ئەویش لەبەر باوکم وازدێنێت...

م. چ: دایکت ناوی چی بوو؟

- ناوی (زەیدا) بوو..

کابرایەکی ((وییالکالی)) هەبوو ناوی ((عەلی موزێری)) بوو لە ((مەزەڵا))وە هات و لەناو ئاوایی بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ((هۆ هۆ مەرخوییەکان ئەوەی دەفتەری نفوسی هەیە بە پەلە بابێت دەفتەر نفوسەکەشی بهێنێت...))

((عەلی موزێری)) ئەرزنجانی بوو، قوتابخانەی ڕوشدیەی تەواو کردبوو.. بە ئەلف و بای عارەبی تورکی دەخوێندەوە و دەینووسی.. خەڵکانێك دەفتەر نفوسی خۆیان برد و پیشانیان دا، زۆری نەبرد گەڕانەوە... برایەکی سەید ڕەزای هاوسێمان هەبوو، کابرایەکی تووڕە و هەڵچوو بوو وتی:

- ئەی ئەوەی نەیبێت؟

ئەوەی ڕاستی بێت خەڵکەکەی لای ئێمە، لە خۆڕا درێژەیان پێدەدا، ئەوەی نفوسی دەبرد دەگەڕایەوە.. خۆ دەیانتوانی هی یەکێکی دیکە پیشان بدەن.. خۆ نەدەهاتن بزانن ڕاستە یان درۆیە..

لە دواییدا، هەندێك لەوانەی نفوسیان نەبوو کۆیان دەکەنەوە، بە یەکەوە دوو دوو دەستیان پێکەوە دەبەستن، بەرەو دۆڵی ((دەرێ سمکۆ)) دەیانبەن.. ئەوێ دارستانە.. ڕێگەکەشی زۆر تەسکە، بە حاڵ کەسێکی پێدا تێدەپەڕێت، ئەملاو ئەولاشی دارستانێکی سخە، کابرایەك لەناو ئەوانەدا دەبێت ناوی ((لازێ حەسێ)) دەبێت، کابرایەکی ئازاو چاوقایم دەبێت.. تومەز چەقۆیەکی هەڵگرتووە.

م. چ: خەڵکی کام دێ دەبێت؟

- ((بورماخی..)).

م. چ: لازێ حوسێ، نازناوی بووە.. ناوی ڕاستەقینەی؟

- نازانم. ئەو پیاوە بەوانی دیکە ئێژێت: من بە چەقۆ، پەتەکەی دەستم دەبڕم.. یەکە یەکە ئەوەی ئێوەش دەبڕم.. ڕاکەن.. بڕۆن، سەربازەکان یەك دوانێکن.. ڕزگار بوونمان زەحمەت نییە.. تەقەشمان لێ بکەن، یەك دوانێکمان پێوەی دەبێت، ئەوانی تر ڕزگار دەبن..)).. ئەگەر وایان کردبایە ڕزگاریان دەبوو، چونکی دارستانەکە زۆر چڕ بوو.. ((سەید برا))ی خەڵکی دیکەشمانیان لەگەڵدا دەبێت.. دەڵێت: ((بیکە بە خاتری پیر کاری وانەکەی.. نامانکوژن.. بەرەڵلامان دەکەن، نەکەیت کاری وابکەیت..)).. لەسەر ڕێگایاندا، ماڵێکی چۆڵ دەبێت، ئەو ٦٠ کەسە بۆ ئەوێ دەبەن.. پاسەوانێك بە سەریانەوە دادەنێن، یەکێکیش لەبەر دەرگا دەبێت.. دوو کەسیش کەمێك دوورتر

چاودێرییان دەکەن.. ئەمجارەش ((لازێ حەسەنێ)) دەڵێت، دەرگای ئەم خانووە بە ئاسانی دەشکێت، من دەرگاکە دەشکێنم و هێرش دەکەینە سەر دوو سەربازەکە، ئەوانی تر خۆیان ناگرن ڕادەکەن.. تا سەربازی تر بێت ئێمە لە چاو ون دەبین.. دیسان ئەو کابرایە دەچێتە لای دەڵێت: ((بیکە بە خاتری حەزرەتی عەلی کاری وا مەکە، هیچمان لێ ناکەن، بەیانی بەرەڵڵامان دەکەن..)) ئەوانی دیکەش هەمان ڕایان دەبێت. ئەمیش ناچار دەنگ ناکات.. لە ژوورەوە هەر دێت و دەچێت، چاوی بە قازمەیەك دەکەوێت.. دەڵێت: ((بەم قازمەیە بە ئەسپایی دیوارەکە کون دەکەم.. دەرچن و ڕاکەن و بڕۆنە ناو دارستانەکەوە.. سەربازەکان ماندوون ئاگایان لە ئێمە نییە..)) کابرا هەمدیس دەچێت و قازمەکەی لێ دەسێنێت.. لازێ دەڵێت ((تەواو ڕزگاربوونمان زەحمەتە.. دەمانکوژن...))

بە تەك ماڵەکەوە، دار بەڕوویەکی گەورە دەبێت، بەیانی سەربازەکان ئەو هەموو پیاوە بە دار بەڕووەکەوە دەبەستنەوە.. لێیان دوور دەکەونەوەو ڕەشاشیان لێدادەمەزرێنن.. بەر لەوەی تەقەیان لێ بکەن.. لازێ دەڵێت: من پەتەکان دەبڕم و ئێوە ڕاکەن.. چاوەڕێی هیچ مەکەن ڕاکەن.. هەندێکمان پێوە دەبین، بەڵام هەندێکمانیش قورتاری دەبێت..)) هەموویان ئەمجارە ڕازی دەبن.. ((تەواو.. بیبڕە...)) هەموویان وا دەڵێن. ئەویش دەستبەجێ پەتەکان دەبڕێت، بە کۆمەڵ ڕادەپەڕن و ڕادەکەن.. لە پێشەوەی هەموویانەوە دەبێت، بەڵام یەکەم کەس ئەو پێوەی دەبێت! هەندێکیان ڕادەکەن و ڕزگاری دەبێت.. بەڵام زۆریان لێ دەمرێت... کاتێك ڕادەکەن دەپەشۆکین و بەیەکادێن و بەر یەك دەکەون.. ئەوانیش لەو کاتەدا لە خۆ ئامادەکردندا دەبن... لە دێکەی ئێمە ((موزیرێ مامێ کەکۆیی، شێخێ سەیدێ گولو، رزێ حەسێ، مەمێ کەکۆیی نازناوی ((بۆزۆ)) بوو، ڕزگاریان ببوو گەڕانەوە بۆ دێکە. ئوسێن زامدار بوو زامداری دیکە هەبوون، لە دەوروبەری ((دەرێ سمکۆ)) ڕێ دەرناکەن، هەندێکیان مردن و چەند کەسێکیانیش بەهەر حاڵێك ببوو خۆی گەیاندبووە ئاوەدانی.. بۆ نموونە ((سەی برا)) چووبووە سەر کانییەکی نزیکی

سەربازەکان، لەوێدا لق و پۆپی پەیدا کردبوو و خۆی لەژێریدا شاردبووەوە. دوای ٣-٤ ڕۆژ هەواڵەکە گەیشتبووە کەسوکاریان، کەسیش زاتی نەدەکرد بپرسێت، کە هەواڵ گەیشت هەموو شتێك تەواو بوو بوو.. موزێری مامی کەکۆیی، شێخێ سەیدێ گولو لەگەڵ ڕیزادا دوای شەش ڕۆژ گەیشتن. بەیەکیشەوە نەبوون هەر یەکە و لەلایەکەوە هاتنەوە. هەندێك لە زامدارەکانیش لە ڕێگا مردبوون.. دایکی شێخ برا، زۆر ژنێکی چاوکراوە دەبێت، ناوی ((چۆپە)) بوو.. ئەو ژنە بە تەنیا کەوتە سۆراخی کوڕەکەی، لاشەکەی دۆزییەوەو هێنای لە دێکەدا ناشتی.. هەندێك لە لاشەکان سووتابوون.. براکەی موزیر، ((چەورێ مامێ کە کۆی)) سووتابوو.. هێنایانەوە لەژێر دار گوێزێکدا ناشتیان، من بینیم...

کە ئەو ٦٠ کەسەیان بەو دەردە برد، ئێمەش لە ترساندا خۆمان شاردەوە، ماڵ و حاڵمان بەجێهێشت و چووینە ناو دارستان و ئەشکەوتەکانەوە. لە پێشدا چووینە ((ویالیکە))، لەوێدا هەندێکمان جیابووینەوە و چووینە چیای ((ئاجی پیخار)) خواردنمان هەر نانەڕەق بوو.. ئێمە چەند منداڵێك بووین کە نانمان دەخوارد تێنوومان دەبوو، نەمان دەوێرا بچین بۆ سەر ئاوان و کانییەکان، دەستمان بە گریان کرد. بۆ ئەوەی کەس گوێی لێمان نەبێت، کە دەگریاین دەیانبردینە ناو ئەشکەوتەکەوە. شەوانە، بەبێ دەنگی دەچووینە سەر کانی.. ڕۆژێکیان، باوکم بە دووربین تەماشای دەکرد، لەپڕ وتی: ((سەرباز.. سەربازەکان هاتن..)) تومەز ((ئاچی پخاریەکان)) لەو ناوەدا خەڵکیان بینی بوو چوونە خەبەریان داوەتە قەرەقول.. لە دەوروبەری ((عەلی بوغاز)) هۆزی ((قوچانی)) لێیە.. نازانم لەسەرچی یەکێان سکاڵای دەبێت، سەربازەکان بۆ بەدواداچووندا هاتبوون.. لە پایین دێکەوە، سەنگەر دەگرن،... باوکم دیسان گومانی کردەوەو چووینەوە ناو ئەشکەوتەکەوە.. ئەشکەوتەکەی کەڵەك چن کرد.. لەولاوە دانیشت و بە دووربینەکەی تەماشای دەکرد تا بزانێت سەربازەکان بەولایدا دێن، یان نا.. بەو جۆرە ٣-٤ سەعات هەر چاوە چاوی بوو.. لەپڕ وتی:

((ئەوە ئەسپ سوارێك دەبینم.. وا پیادەیەکیش لە ((ئەجی پێخار))ەوە هات.. وا چووە لای سوارەکە، قسە دەکەن.. سوارەکە جلی سەربازی لەبەردایە...

تومەز هاتووە لێیان بپرسێت: ((دەڵێن قۆچانییەکان لەم ناوانەدان.. راستە؟.. کابرا پێی وتبوو ((درۆیە.. قۆچانی و مۆچانی لەم ناوانەدا نین...)).. ئەم هەواڵانەمان دواتر زانی..

دانیشتووانی ئاوایی ((ژیارە)) پەزەکانیان بۆ ئەو ناوانە دەهێنا، هەندێك لە پەزەکانیان ون دەبن یەك دوو شوان بە دوای پەزدا دەگەڕان.. کەسی دیکە لەم ناوانەدا نییە..)) وای پێگوتبوو... تومەز ئەوەی ((موزیر ئاغا)) بووە، کە بەدەم سوارەکەوە ڕاوەستا.. موزیر ئاغا، دەیزانی ئێمە لەو ئاقارانەداین، سەربازەکە بڕوای پێدەکات و دەگەڕێتەوە... ئەو ڕۆژە لەوێ ماینەوە، بۆ بەیانی، سەرباز هاتە چیای ((حەیدەر باوا)).. کەس نەیزانی بۆ هاتبوون بۆ ئەوێ.. لەو دەوروبەرە ((کورێ شانەکان)) دادەنیشتن، هەندێك عەشیرەتی دیکە لەو نزیکانە هەبوون، هەمووشیان ڕایانکردبوو، چووبوونە دارستانەکەی ((چاخلی)).. سەرباز لەوێدا دەیانبینێت و هەموویان دەبەن، بە منداڵ و ژن و پیرەوە، هێنابوویان بۆ ڕاستییەك.. لەوێ زۆریان لێکوشتن.. لەوانە: بەرتییێ، ئاغاییێ یووسف،.. من هەر ئەو دووانەم لەیادە..

باوکم بە دووربینەکەی تەماشای ئەو کوشتارەی کردبوو، ئەوەی دەبینی ئەوکاتە بۆ ئێمە دەگێڕایەوە.. بەدەم تەماشاکردنەوە وتی: ((ئەوە منداڵێك ڕایکرد و چووە ناو شیوەکەوە.)) لەم کاتەدا ئێمەش حەزمان دەکرد تەماشا بکەین..

دواجار زانیمان ئەو منداڵە کێ بوو.. ئەوە ئێستا لە ژیاندا ماوە، ناوی ((شێخە))یە...

بۆ بەیانییەکەی، باوکم: بابیگوێزینەوە بۆ شوێنێکی تر.. چووینە (ئەجی پیخار) لەوێ چووینە ماڵی (موزیر ئاغا)، نان و ماستی لەبەردەم داناین، تێرمان خوارد.. ژمارەمان ٢٠ کەس بوو...

م. چ: ژن و منداڵی وردتان لەگەڵدا بوو؟

- نەخێر.. ژن و منداڵەکان چوونە ((ویالك)).. تەنیا دوو کەسمان چەکدار بوو.. باوکم و ئیبراهیم ئاغا.. ئەمجا بەرەو ((ویالك)) کەوتینەڕێ لە ڕێگا کانییەك هەبوو، لای کانییەکە کاروانێکمان تووش بوو.. ئێمە ترساین لا ڕێمان گرت و پێمان هەڵگرت.. ئەوان دەستیان کردە گاڵتە پێکردن: ((ئەها ڕایانکرد..)) دنیا تاریك داهات.. ئیبراهیم ئاغا وتی: بابڕۆم یەك دووانێکیان لێ بکوژم.. باوکم وتی ((نەکەی، دەڕۆن ژن و منداڵەکان دەکوژن..)) ئیتر وازی هێنا، ئەوانیش ڕۆیشتن.. لەوێوە چووینە پشتی خانووەکەی ((کامۆری))، بەو نیازەی ئەو ببێتە چاوساغمان و بمانباتە ناو دێکە..

م. چ: دێکە ناوی چی بوو؟

- ((ویالیکە))ی ناو بوو.

کاتێك لە نزیکی ماڵی ((کاموری)) بووین گوێمان لە هاوار و گریان بوو، باوکم وتی: ئەم ماڵە کارەساتێکیان بەسەردا هاتووە، با یەکێك بڕوات بزانێت مەسەلە چییە.. یان سەرباز هاتوونەتە ماڵەکەیەوە، یان دز و جەردەن دەیانەوێ تالانی بکەن.. بڕۆ و زوو وەرەوە ئاگادارمان بکەرەوە..))

تومەز، هەرکە تاریك دادێت، سێ سەرباز دەچنە ماڵەکەیەوە، گەرەکیان بووە ((کاموری)) ببەن بیکوژن، کاموری، بەهێز و ئازاد دەبێت، هەرچەندە دەکەن ناتوانن پەلکێشی بکەن و لە ماڵەوەی وەدەرخەن... (ئەم کامورییە بە پیلانی حکوومەت ساڵی ١٩٤٠ز لە خۆزات کوشتیان).

کە سەربازەکان دێنە حەوشەوە، ژنەکەی لە سەربانەوە خۆی دەخاتە کۆڵان و خۆی دەگەیەنێتە ((خانۆ)).. لەو کاتە ((عەلی بەگی)) مامی لەوێ دەبێت.. (ئەو عەلی بەگەش لە خۆزات لەگەڵ ((کاموری))دا دەکوژرێت) کاتێك ((حەمەد)) ئەوەی باوکم ناردبووی.. دەڕواتە بەر دەرگاکەیان دەبینێت سەربازەکان دەیانەوێت بە زۆر کاموری بەکێش بکەن و لە ماڵی دەربهێنن، دوای بگرە و بەردە، بە سێ لیرەی زێڕ وازی لێدێنن.. دواجار دەچێتە حەوشەوە.. کە چاوی پێدەکەوێت دەپرسێت: ((لە کوێوە

دێیت حەمەد))؟ ئەویش تێی دەگەیەنێت، کە سەید ئاغا ناردوویەتی و هاتووە بۆ لای تۆ..

لەو دەمەدا خەریك بووین بەرەو ماڵی کاموری دەڕۆیشتین.. گوێمان لە ژاوەژاو بوو وامانزانی سەربازن، دووبارە خۆمان شاردەوە.. تومەز ئەوانە قۆچانییەکان بوونە ئەوانیش هەڵاتوون، بە دوای شوێنێکدا دەگەڕان.. ئێمە ئەو شەوە چووینە ((ئینجیخە)) تا بەیانی لەوێ ماینەوە.. دواجار کاموری هات و بردینی بۆ لای جەماعەتەکەی خۆمان.

م. چ: لەو کاتانەدا لە کوێ بوون؟ لە دێکەی خۆتان بوون یان لە شوێنێکی دیکە.. دێکەی ئێوە ((مارخۆ))یە وانییە؟.

- کە دێکەمان چۆڵ کرا، (مارخۆ)یان سووتاند، هەر لەو کاتانەدا زۆربەی ئاوابییەکانی دەرسیم قەدەغە کرابوون {موحەڕەمە} بوون.

م. چ: باشە کە ئارام بووەوە چی ڕووی دا؟ چۆن لە دەرسیم دەژیان؟

- ئارام نەبووین هیچ کاتێك.. زوڵم و جەورکردن دوای ٣٨ هەر بەردەوام بوو.. دەوڵەت بەگومان بوو لەو خەڵکە.. بەتایبەتی لە بنەماڵەکەی ئێمە.. بە بەهانە بوون.. با نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە:

((دوایساڵی ٣٨ بە دوو ساڵ (قاپۆ حسێن قوچانلی) لەو شوێنەی دایان نابوو رایکرد، هاتە دەرسیم، سەرباز هاتن و گرتیان، بەو شەوە خەڵکێکی زۆریان کۆکردەوە و بردنیان بۆ عەلی بوغاز، زستان بوو، ((باوکیشم))یان برد... لە ((ویالیك)) موختارێك هەبوو، کوڕەکەی ساڵی ٣٨ کوژرابوو، ئەو موختارە دەنگی یەکجار خۆش بوو، هەموو جارێك بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گۆرانی بۆ کوڕەکەی دەگوت. ئەوەی گوێی لێ دەبوو دەبووایە بگریایە... لەو دەمەدا ئەفسەرێکی پلە گەورە ناوی ((بەکر)) دەبێت، لە ((ئوڤاجیك)) دەبێت، رۆژێك ئەو ئەفسەرە دەڕواتە ((ئوڤاجیك)) موختارەکە بانگ دەکات، لێی دەپرسێت: چەك لە دێکەدا هەیە؟.)). ئەویش دەڵێت: ((لە دێکەدا چەك نییە و نازانین کێ هەیەتی و کێ نییەتی)).. ئەفسەرەکە ئەمەی

پیّ ناخۆش دەبێت، دەیکاتە ژوورێکەوە و دەرگاکەی لیّ کلۆم دەدات و دەست بە لێدانی دەکات، خۆی و جەندرمەکانی ئەشکەنجەی دەدەن، ئەوەندەیان لێدا لەژێر دەستیاندا گیانی دەرچوو...

باوکم، تەماشا دەکات، وازیان لیّ ناهێنن دەڵێت ((بەم جۆرە ژیان ناچێتە سەر.. دەبێت خۆمان قورتار بکەین..))..

ژنەکان کۆدەکاتەوە، ئەوجا بە ژنەکان دەڵێت بەڵکو لەبەر ئێوە ئیتر لێی نادەن، کە ژنەکان دەڕۆنە ژوورەوە، موختار حاڵی پەرێشان دەبێت، زۆری نەبرد مرد..

دواجار، کە گەورە بووم و چووم بۆ سەربازی، ئەو ((بەکر))ە ببووە بین باشی، کونیەکەمی خوێندبووەوە.. ڕۆژێکیان لێی پرسیم: باوکت ماوە؟ وتم: بەڵیّ ماوە..

سیّ چوار ساڵ دوای ٣٨، ڕۆژێکیان ڕوانیمان لەبەر دەرگای ماڵی خۆمان ڕاوەستابووین، باشچاوشێك لەگەڵ چەند سەربازێکدا هاتن.. مونزور ئاغاشیان لەگەڵدا بوو، یەکسەر چوونە ماڵی موختار وتیان: ((وەرە دەچینە ماڵی (سەیدالیّ توپوز)، یانی ماڵی ئێمە.. موختار بۆ ماڵی ئێمەیانی هێنان، هەرکە گەیشتینە بەر دەرگا بە سەربازەکانی گوت: چەکەکانتان ئامادە کەن..)) وای گوت و فەرمانی دا بچنە ژوورەوە.. چوونە ژوورەوە، ماڵەکەیان پشکنی، ئاخوڕ و کادێنەکەشیان پشکنی، بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە.. هەندێك نامەیان دۆزییەوە، کە بە پیتی عەرەبی بە تورکی نووسرابوو. لەگەڵ یەك دوو فۆتۆگرافدا بردیان.. دواجار زانیمان، نامەکانیان بۆ ئەنقەرە ناردبوو تا بزانن چییان تێدایە، نامەکانیان گەڕاندەوە، بەڵام وێنەکانیان نەگەڕاندەوە.

م. چ: بۆ ماڵی ئێوەیان پشکنی؟

- گوایە، ئێمە لەگەڵ ڕووسیادا!! پێوەندیمان هەیە. هەر هەمان ڕۆژ ماڵی مامەمیانیش پشکنی بوو ئەو کاتە لە ((ئالانیان)) بوون.

## ئێمە لە چنگی فەلەك قورتار بووین

مونزور چەم: ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم، ساڵی ١٩٣٨ز ت لەیادە؟

یووسف: بەڵێ، ئەودەمە دە ساڵان بووم.. هەموو شتێکم زۆرباش لەیادە..

م. چ: دەتوانی بۆمانی بگێڕیتەوە؟

- دەتوانم..

م. چ: دەفەرموو..

- هاوینی ساڵی ١٩٣٨ز، بە تەمەنەکان و ئەوانەی لە ئێمە گەورەتر بوون، لە نێوان خۆیاندا بەردەوام باسیان لە شەڕ و سەرباز و قەتلوعام دەکرد.. دەیانگوت: ((سەربازێکی زۆر هاتووە.. چیاو دۆڵەکان پڕن لە سەرباز، دەبێ ئەم کافرانە نیازیان چی بێت؟! نازانین...)) ترسێکی زۆر هەموو لایەکی گرتبووەوە، خەڵکەکە نەیاندەوێرا و پێیان ڕێی دانەدەگرت بۆ هیچ جێگایەك بڕۆن.. لەناو ماڵ و حاڵی خۆیاندا لەناو دڵەڕاوکێ و ترسدا دەژیان.. درێژەی پێ نادەم.. ٣٨ تۆفانێك بوو، تەم و دووکەڵێك بوو ئاسمان و زەوی گرتبووەوە..

م. چ: باشە، کە دەترسان بۆ دێکەیان جێ نەدەهێشت و بڕۆن؟

- بۆ کوێ بڕوایەن؟ وا ڕۆیشتن، تاکەی لەو شوێنە بمانایەتەوە، مەزراو دەغڵیان هەبوو.. کاتی دروێنە بوو.. بۆستانیان هەبوو.. ماڵ و حاڵیان، ئاژەڵیان هەبوو.. کارو کاسبییان تەرك بکردایە بۆ کوێ بڕوایەن؟ لەلایەکەوە دەترسان، لەلایەکەوە دەیانگوت: ئێمە گوناهمان نییە، سەرباز چی لە ئێمە گەرەکە؟.. هیچمان لێناکەن.. وا بیریان دەکردەوە..

م. چ: باشە لە دەوروبەرتان کەسیان کوشتبوو؟

- ئەی چۆن.. خەڵکەکە ئاگای لەوە هەبوو، کەوا خەڵکێکی زۆریان کوشتووە.. گەلێك جار دانیشتووانی دێیەکیان دەهێنا لەولای دێکەی ئێمەوە دەیانکوشتن.. دەیانگوت: ((دەوڵەت بۆ ئەوە ئەمانە دەکوژێت، چونکی لە دژی دەوڵەت چەکیان هەڵگرتووە. ئەگینا حکوومەت کەس ناکوژێت، هەقیان بەسەر ئەوانەوە نییە کە شەڕیان نەکردووە..))

لەو تۆفانەدا، ڕۆژێکیان تازە خۆرهەڵهاتبوو، لەپڕ وتیان ((سەربازەکان هاتن))! هەواڵەکە ئاوا بڵاوبووەوە.. کابرایەك لە مەزراکەی ((سەکەرنۆ)) دادەنیشت، ناوی ((حەسێ مستێ)) بوو، هاتبووە دێکەمان.. کابرایەکی ئازاو ژیر بوو، کە لە دوورەوە سەربازەکان دەبینێت، دەزانێت نیازیان خراپە.. لەوێدا بانگی من و ئامۆزاکەمی کرد: ((ئا وەرن..))!

م. چ: بۆ هەر ئێوەی ئاگادارکردەوە؟

- تەنیا لەوکاتەدا ئێمە لەو ناوە بووین.. بە پەلە چووین بۆ لای، وتی: دوام بکەون.. لەولامانەوە، گەنمە شامی بە باڵای زەلامێك بوو، ئێمەی بردە ناو گەنمە شامییەکەوە.. وتی: لێرە دانیشن تا بانگتان نەکەم سەر هەڵمەبڕن و نەیەنە دەرەوە.. وتمان: باشە..

حەسێ، لە ئێمە دوورکەوتەوە، نەچووە ناو ئاوایی، چووە لای ((دارێ زیارێ))- ئەو دارانە زیارەتگا بوون-، لە پشت ئەو دارانەوە، گردێك هەبوو، چووە سەر گردەکە.. زۆری نەخایاند، سەرباز چوون گورگی برسی خۆیان بە دێکەدا کرد و بە دێکەدا بڵاوبوونەوە.. بە پەلەپەل دەرگاکانیان دەکردەوە نەکرابایەتەوە دەیانشکاند و دەچوونە ژوورەوە، خەڵکەکەیان کۆکردەوە، هێنایانن لە شوێنێکدا کۆیان کردنەوە، دواجار بردنیانن بۆ لای کۆمەڵتەدارەکان، کە زیارەت دەکران.. بە یەکەوەیان بەستنەوە و لەبەر هەتاوەکە دایان نیشاندن.. سێ چوارێکیان بەجیا بەستبوونیانەوە، ماوەیەك هەروا لەو ناوە مانەوە.. دواجار ((قومەندانەکە)) هاتە سەر سەریان وەستا،

یەکە یەکە پێیاندا هەڵیڕوانی، بەناویاندا سووڕێکی خوارد.. لەپڕ وتی: موختار...!
موختار: فەرموو گەورەم..
- دێکە هەموویان لێرەدان؟ کەس ماوەتەوە؟
موختار، بەڕاست و چەپا چاوێکی گێڕا.. ڕەنگی زەردهەڵگەڕا، دوای کەمێك وتبووی..
- دوو منداڵ لێرەدا نابینم قوماقان بەگ.
- باشە، کە لێرە نەبن، ئەی لە کوێن؟
- نازانم..
- دەبێ ئەو دوو منداڵە بدۆزنەوە.. ئەوانەمان دەست نەکەوێت، لێرە ناڕۆین.. رامەوەستە لە کوێن بیاندۆزەوە، ئەزیەتمان نەدەن...
موختار: نازانم لە کوێن قوربان.. چوونیان بهێنم..؟
قومەندان: کەمێك بیر بکەرەوە.. دەیاندۆزیتەوە...
وەلی موختار، دەبینێت چارە نییە، ناوی ((حەسێ)) دەدات..
- قوربان، حەسێ دەتوانێت بیانهێنێت..!
قومەندان، حەسێ مستێ، بانگ دەکات و لێی دەپرسێت.. بەڵام ئەو متەق ناکات.. کە دەبینن دەنگ ناکات.. یەکێك لەناو ئاپۆرەکەوە دەڵێت: ئەو پیاوە تورکی نازانێ قوموتان بەگ.. یەکێك داواکەی قوموتان بە کوردی بە حەسێ دەگەیەنێت.. لە پێشدا، حەسێ نازانێت چ بڵێت.. بەڵام دواجار دەڵێت: باشە... حەسۆ، دێتە لامان.. وتم ڕزگارتان دەکەم، بەڵام پێم نەکرا.. ئێمەش کەوتینە دوای...
م. چ: باشە، بەلای تۆوە، موختار بۆ وایکرد؟.
- بێ گومان لەترسا...
بەو جۆرە کەوتینە دەستی ئەو گورگە برسییانە...
م. چ: دایکت و باوکت ناویان چی بوو؟

- دایکم ناوی ((خێجان))بوو.. باوکم ((مورسا))ی ناوه... دێکەمان مەزراو بۆستانی زۆر بوو.. گوندۆرەو شووتی، تەماتە، فاسۆلیای تێدا بەرهەم دەهێنرا.. لەبەر چاوی ئێمەوه، سەربازەکان تێیاندا دەگەڕان.. کە خۆیان تێریان خوارد، ئەمجارە ئەسپ و هێسترەکانیان تێدا بەرەڵڵا دەکرد.. بەو جۆرە تا نیوەڕۆ ماینەوە.. پێیان وتین برسیمانە.. خواردنمان بۆ ئامادە بکەن.. ئێمە هەموو دەستمان بەسترابووەوە کێ خواردنیان بۆ ئامادە بکات؟.. کەس متەقی نەکرد و وەڵامیان نەدایەوە.. دەستی دایك و باوکمیان کردەوە، وتیان ((بڕۆن خواردنمان بۆ ئامادە بکەن..))!.

باوکم و دایکم هەستان و ڕۆیشتن.. کە ئەوان رۆیشتن منیش هاوارم دەکرد ((منیش لەگەڵ دایك و باوکمدا دەڕۆم..)) کە قوموتان گوێی لێبوو، بە وەرگێڕەکەی وت: ((ئەوە چی دەڵێت؟)) وەرگێڕەکە، تێیگەیاند.. تەماشایەکی کردم و وتی، دەستی بکەنەوە بابڕوات...

دایکم و باوکم بە پەلەپەل، کەوتنە ئامادەکردنی خواردن.. دوو سەرباز لە دەرگا چاودێری دەکردین.. دەترسان ئێمە ڕاکەین.. دایکم دەستی کردە هەویر شێلان، ئاگریان داگیرساند.. چەند تاوەیەکیان هێنا، ڕۆنیان داخ کرد دایکم بەدەم ((نان ساجی)) کردنەوە فرمێسکی دەڕژاند.. سەربازەکان خواردنەکەیان برد و ئێمەشیان لەگەڵ خۆیاندا گەڕاندەوە.. هەمدیس دەستمیان بەستینەوە.. نانەکەیان خوارد.. ئێمەیان لەبەردا، گەیشتینە کەناری ڕووباری ((هەرچیغە)).. دەمانزانی نیازی کوشتنمانیان هەیە.. چونکی بەر لە ئێمە، هەر بەم جۆرە خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو..

م. چ: بیستبووتان کەسیان کوشتبێت؟

- بەڵێ.. چەندین جار، ژن و منداڵیان بۆ ئەم ناوانە هێنابوو کوشت بوونیان، هەندێکیان کە تەقەیان لێدەکرد، دەکەوتە ڕووبارەکەوە.. هەندێکیش لاشەکەی لەم ناوە دەمایەوە..

گریان و فیغان دەستی پێکرد.. منداڵەکان لە ترسا دەلەرزاین، لەوێ بەڕیز ڕایانگرتین.. وتیان لەسەر چۆك دانیشن، وامان کرد.. چاوەڕێی مردنمان کرد.. هەموو لەو بڕوایەدا بوو کە تەواو دەکوژرێین.. ماوەیەك هەرواماینەوە.. چاوەڕێی گوللەبارانی خۆمانمان دەکرد.. لەپڕ قوموتانەکە وتی: ئێرە، لە دێکانەوە نزیکە.. با کەمێ دوریان بخەینەوە.. هەڵیان ساندین، کەوتینە ڕێ، ڕوومان لە ڕووبارەکە کرد.. گەیشتینە قەراغ ڕووبارەکە، دیسان ڕایانگرتین لە نێوان ڕووبارەکە و ئێمە هەر ٢٠م نێوانمان هەبوو.. لەوێ جارێکی تر چاوەڕێی مردنمان کرد.. لە دووری ئەسپ چەند سوارێك بەتاو دەهاتن.. ڕوویان لە ئێمە کرد.. نەماندەزانی کێن، هەرکە گەیشتن چوونە لای کومەتان کاغەزەکەی خوێندەوە، تاوێك مات بوو.. وەك لەگەڵ خۆیدا بیر بکاتەوە.. جارێکی کە کاغەزەکەی خوێندەوە.. هەمدیس ماوەیەك بێ دەنگ دایگرت، مات و بێ دەنگ.. هەموو چاوی لە دەمی بڕیبوو.. دەیانویست بزانن مەسەلە چییە.. لە دواییدا ڕووی کردە وەرگێڕەکە، شتێکی پێ گوت.. وەرگێڕەکەش وتەکانی ئەوی بە کوردی کرد:

((لێبوردنتان بۆ هاتووە.. هەموو شتێك کۆتایی هات.. ئیتر هیچمان لەگەڵ ئێوەدا نییە، بۆ دێکانی خۆتان بگەڕێنەوە.. لێبوردنە))

خەڵکەکە لە خۆشیان نەیاندەزانی چی بکەن.. هەندێك کەس پێدەکەنی، هەندێ دەگریا، هەندێك دەستی بۆ ئاسمان بەرزدەکردەوە و دوعای دەکرد... بەڵام، دووکەسیان گلدایەوە.. ئەو دووانە برابوون.. یەکێکیان ناوی ((حوسێن)) و ئەوی تریان ناوی ((باقل)) بوو.. ئەو دووانەیان دوورخستەوە.. خەڵکەکە کەوتنە، ورتە ورت، بۆ بەریان نەدان.. بەڵام کەس زاتی نەکرد بپرسێت. ئیتر خەڵکی کەوتە ڕێ، بەڵام هەموومان گوێمان هەڵخستبوو.. دوای ماوەیەکی کەم، یەك دوو تەقەمان بیست.. وتمان ((بەڵێ کوشتنیان..)) بەدەم ڕێگاوە هەندێك هەر دەگریا.

لە دێکە ماینەوە.. دوای ماوەیەك، دوو چەکدار لەگەڵ دوو سەربازدا هاتنە دێکەمان خەڵکی کۆبوونەوە.. تا بزانن بۆچی هاتوون. پرسیاری ئەو دوو برایەیان لێکردن، وتیان، خۆتان خۆشبن، حسێن و باقل کوژران.. خەڵکەکە پرسییان بۆ

کوشتنیان، لێبوردن دەرنەچوو بوو؟ وتیان ((ئێمەش نازانین)) دوای ئەوەش هەر ئەو پرسیارە دەکرا، بۆ؟.

یەکێك لە چەکدارەکان خەڵکی دێی ((قورکەز)) بوو، ئەو کاتە ئەو لەوێ بووە، وتبووی: هەردوو براکەیان بەیەکەوە بەستەوە.. لەبن دارێکدا ڕایانگرتن ((باقل)) قسەی ناشیرینی بە قوموتان گوتبوو.. ئەوجا، باقل جیادەکەنەوە.. حسێن بە گوللە دەکوژن، باقل بە نێزە کوشتیان..

**ئەگەر یەك بوایەین دەوڵەت هیچی بۆ نەدەکرا..**

مونزور چەم: بە کورتی خۆتمان پێ بناسێنە؟

حەسەن: ناوی حەسەنە، باوکم ئیبراهیم.. حەسەنێ ئیبراهیم ئاغا، لە رەسمیاتدا نازناومان ((چەتین دەرە))یە، باپیرەم ناوی ((پاشا)) بوو.. هۆزەکەمان ((سوران)) یان ((سورۆ))یە.. دێکەمان ناوی ((مەرخۆ))یە. دایکم تورکە، خەڵکی گوندی ((سورپیان))ە، کچی ((مەمەد ئاغا))یە و ناوی ((ئاسیا))یە..

م. چ: بەر لە ساڵی ١٩٣٨ز، لە ساڵی ١٩٣٦ز، دەوڵەت لێبوردنی دەرکرد تاکو هەموو کەسێك چەکەکەی تەسلیم بکات.. لەم لایەنەوە بەیانی دەرکرد کەس جەزا نادرێت.. لەم ڕووەوە چیت لە یادە؟.

- من ئەو دەمە منداڵ بووم، بەڵام هەندێك شتم لەو بارەیەوە لەیادە.. کە ئەم هەواڵە بڵاوبووەوە ڕۆژێکیان، چەند کەسێك لە هۆزەکانی دیکەوە هاتن، مامم لە مڵی ((فندك)) ئاغا بوو، لەگەڵ خەڵکەکەدا کۆبووەوە، نوێنەری ((سەید رەزا)) هاتبوو کەوتنە گفتوگۆ، ڕاوبۆچوونەکانیان یەك نەبوو.. هەندێکیان دەیانگوت: ((با چەکەکانمان تەسلیم بکەین تا ئەزیەتی خەڵکەکە نەدەن..)) هەندێکی کە ((.. ئەمە داوێکە لەلایەن دەوڵەتەوە.. کە چەکەکانیان کۆکردەوە دەمانکوژن.. ڕاستییەکەی ئەوەیە، تا بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین و شەڕ بکەین، یەك پارچە بین، ئەگەر یەك بگرین دەوڵەت زەبەرمان پێ نابات...)).

مامەم، لەگەڵ ئەم بۆچوونەی دواییەدا بوو.. لەگەڵ تەسلیم کردنی چەکدا نەبوو..

م. چ: هەر لەو کۆبوونەوەیەدا، باسی ((بەیتەر نوری)) و باوکی کرا.. لەم بارەیەوە زانیاریت هەیە؟.

- باوکی ((نووری بەیتار)) لەکاتی خۆیدا، لە دێکەی ئێمە مامۆستا بووە.. ئەویش بەم جۆرەیە.. ((باپیرەم پاشا ئاغا، حەزی کردووە لە دێکەماندا قوتابخانە هەبێت.. لەمبارەیەوە لەگەڵ باوکی نووری بەیتاردا قسەی کردووە.. باپیرم مانگانەکەی پێ دەدا.. جێگاشی دابین کردووە و منداڵان خوێندوویانە.. ٦٠-٧٠ قوتابی لەو دەوروبەرە هەبووە.. ئەم کارە ماوەیەك دەوامی هەبووە.. بەیتار نووری بەم بۆنەیەوە بووە دێکەمان بناسێت و ناسیاریمان لەگەڵدا پەیدا کردووە..

م. چ: تۆ خۆت (بەیتار نووری)ت بینیوە؟.

- بەڵێ.. بینیومە.. چاکم لە یادە..

م. چ: چۆنت بینی؟ چی دەکرد؟ چی دەگوت؟

- لەگەڵ مامما ئاوەڵ زاوان.. بەیتار خەریکی سیاسەت بوو.. بۆیە هەمیشە خۆی لە دەوڵەت دووردەخستەوە.. وەك گەنجانی ئەمڕۆمان چۆن وریای خۆیانن، بە نهێنی دەچنە ناو کاروباری سیاسییەوە، ئەویش ئاوا بوو هەر بە تەنیا لە حکوومەت خۆی نەدەشاردەوە، لە هەندێك دەرسیمییەکانیش سڵی دەکرد.. زۆرێك لە بەتەمەنەکان حەزیان بەوە نەدەکرد کە خەریکی سیاسەتە، لە دەوڵەت دەترسان، ئەویش بە نهێنی کاری خۆی دەکرد... بەیتار، پیاوێکی لەسەرخۆ بوو.. شەوان کە لە ماڵی مامم دەمایەوە تا بەرەبەیان هەر خەریك بوو، هەمیشە کاغەز و قەڵەم و کتێبی لەبەر دەستدا بووە.. دەینووسی و دەیخوێندەوە..

م. چ: ساڵی ١٩٣٧ز، لە دێکەی ئێوە، شەڕ و پێکدادان لەگەڵ سەربازەکاندا رووی داوە؟.

- نەخێر.. شەڕی وا ڕووی نەداوە، بەڵام بەزۆری پیاوان لە ئاوایی نەدەمانەوە، دەچوونە چیاکان، یان لە دارستانەکان دەمانەوە.. لە دێکەدا تەنیا ژن و منداڵ و

پەککەوتەکان دەمانەوە... ئەوکاتەش بارودۆخەکە هەر وەك ئەمڕۆ بوو.. چۆن ئێستا دێت و خەڵکەکە کۆدەکەنەوەو دەیانبەن، ئەو کاتانەش، ساڵانی ١٩٣٧-١٩٣٨ز هەروایان دەکرد، بۆیە خەڵکەکە لە دێکاندا نەدەمانەوە. مەگەر تووشی سەرباز بووایەن و ناچاری شەڕ بووایەن.. بێ گومان خەڵکێکی زۆریش بەر لەوە چەکی تەسلیم کردبوو، بێ چەك مابوونەوە..

م. چ: لە ساڵی ١٩٣٨ز کە سەربازەکان هاتن چییان کرد؟

- شەڕیش نەما.. هەر دەهاتن.. لە ((تورشمەگە))وە دەهاتن و لەلای ئێمەوە بۆ ((خۆزات)) دەڕۆیشتن... دێکەمان چوار پێنج مەزرای گەورەی لێبوو.. یەکێك لەو مەزرایانە لە ((وارە دەرە))دا بوو.. تورکەکان ئێستا ناوەکەیان گۆڕیوە، کردوویانە بە ((واریدار Varidar)) ئەو مەزرایە دەگەیشتە سەرووی ((مەرخۆ)).. ئێستاش ماڵمان لەوێدایە.. ((وارە دارە)) شوێنەکەی بەرزییە، لەوێوە ئەو دەوروبەرەت لێوە دیارە. لەوێوە تەماشامان کرد، مێرووله ئاسا سەرباز بەڕێوەیە.. زۆر چاك لە بیرمە، ڕۆژێکیان لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە، هەر سەرباز تێدەپەڕی، کۆتایی نەدەهات..

م. چ: کەس لە دێکەی ئێوە کوژرا؟

- لە پێشدا دەمەوێت بڵێم: لە نزیکی ماڵەکەمانەوە، قەرەقوڵ هەبوو، لەوێ بەڕێوەبەری ناحیە هەبوو.. بەڵام لە ڕاستیدا ((فیندق))ی مامم بەڕێوەی دەبرد، ڕۆژێك پاسەوانێکیان دێتە لای مامم: ((بەڕێوەبەر دەیەوێت بتبینێت..)) مامم دەڕوات، بەڕێوەبەرەکە پێی دەڵێت: ((ماوەیەکە لێرە بەڕێوەبەرم، تا ئێستا هەموو شتێك بەدەستی تۆ بووە. یارمەتیمانت داوە، فەرمان هاتووە، دەست لە خەڵکەکە نەپارێزین، بەڵام من حەز ناکەم تۆ زیانمەند بیت.. وای بەباش دەزانم، تۆ ((تەرحیل)) بکەین.. مامم، پێشبینی دەکرد چی ڕوودەدات... لەوێ بە پاسەوانەکە دەڵێت: ((ئیسۆ)) ئەم بێ نامووسە بۆ کوشتنمان دەنێرێت.. بەڵام بەداخەوە لە دەستمان دەرچوو، درەنگ کەوتین ڕزگارمان نابێت...))

سەربازەکان مامەم و ژن و منداڵەکانی دەبەن.. ماوەیەك دەڕۆن، لە نێوان ((تورش مەگە)) و ((کاوکۆ))دا هەموویان دەکوژن... شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((قاریێ یووسفیێ)) لەوێ دەیانبەنە دۆڵێکەوە و دەیانکوژن.. ٢٤ کەس دەبن، تەنیا منداڵێکی ١٢-١٣ ساڵانیان تێدا رزگاری دەبێت ئەو منداڵە ناوی ((برا)) بوو، کوڕی ((ئاغا)) بوو و لەمن گەورەتر بوو.. خۆی هەموو شتێکی دەگێڕایەوە..: ((لەوێ پیاوەکانیان جیاکردەوە.. مامەم، لێی تێتە دەنگ، وتبووی ((یوزباشی دەمەوێت هەندێك شتت پێ بڵێم.. یوزباشی دەیەوێت قسەی پێ ببڕێت، بەڵام ئەو بەردەوام دەبێت ودەڵێت: ((دەزانم دەمانکوژن.. بەڵام لە پێشدا ژن و کچەکان بکوژن..)).. یوزباشی دەڵێت: ((سەرچاوان فندق ئاغا.. لە پێشدا ئەوان دەکوژم.. دواجار تۆ دەکوژم...))

کە ئێمەیان کۆکردەوە، دایکم منی خستە ژێر کراسەکەی وتی: ئەگەر کەوتم لەژێرەوە چاوەڕێ بکە و زوو دەرمەچۆ تا سەربازەکان دەڕۆن، بەڵکو ڕزگارت دەبێت...)).. دەیگێڕایەوە دەیگوت: من لەژێر کراسەکەی دایکم بووم تەقەیان لێکردین، دایکم کەوت، منیش لەژێرەوە مامەوە.. ماوەیەك تێپەڕی.. سەربازەکان ڕۆیشتن.. بەڵام زۆر دوور نەکەوتبوونەوە، منداڵێك لەو کاتەدا گریا.. منداڵێکی ٦-٧ مانگان بوو. سەربازەکان هەمدیس هاتن.. گەڕان ئەو منداڵەیان لەباوەشی دایکیدا بینی، هیچی لێ نەهاتبوو.. بەڵام کوشتیان.. من هەر خۆم مت کردبوو لەژێر کراسەکەی دایکمدا...)).

تومەز، برا لە ترساندا دەبوورێتەوە، دوای ماوەیەك وەئاگادێت.. هەڵدەستێت بەدەم گریانەوە لەو ناوە دووردەکەوێتەوە.. لەو ناوە شوانێك دەیبینێت، شوانەکە دەپرسێت، لەم ناوە چی دەکەیت؟ برا.. بۆی دەگێڕێتەوە: ((هەموومانیان ئا لەوێدا کوشت)).. شوانەکە دەیباتە ناو دارستانەکەوە یەك دوو کەس ئاگادار دەکاتەوە.. شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((گوزا چوتە)) دەیباتە ئەوێندەرێ، شوێنێکی بۆ دەسازێنێت و دەڵێت، لێرە مەجوولێرەوە.. لە ترسا نایباتە ناو دێکەیانەوە..

م. چ: ئە شوانە خەڵکی کوێ بوو؟

- ((کاوکوڵی)) بوو..

((برا)) چوکی بە ئاستەم بریندار بوو، لە دێی ((زەمێقە)) کابرایەك دەبێت، ناوکەیم لەبیر نییە.. وابزانم ناوی ((ڕەزا)) دەبێت، ئەو زامەکەی تیمار دەکات.. ((برا)) نزیکەی مانگێك هەر لەو شوێنە دەمێنێتەوە.. شوانە خواردنی بۆ دێنێت و کابراش زامەکەی تیمار دەکات.. کاتێك ئەوان قەتلوعام دەکرێن، باوکم لەماڵ نابێت، باوکم بۆ لای خوشکە گەورەکەم چوو بوو، کە لە دێی ((خێچە)) مێردی کردبوو.. کە باوکم گەڕایەوە، خوشکەکەمی لەگەڵدا نەبوو.. بۆ ڕۆژی دواتر زاواکەمان لەپڕ پەیدا بوو، هات وتی: ((لە ماڵەوە چەکمان نییە، چەکێکم بۆ پەیدا بکەن، ئەگەر هاتن بۆ کوشتنمان هیچ نەبێ بتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین..))..

باوکم ٣-٤ ماوزەری بۆ پەیدا کرد و لەگەڵ خۆیدا بردی.. باوکم، هەم بۆ هاودەنگی زاواکەمان، هەمیش بۆ ڕازیکردنی کچەکەی، لەگەڵ زاواکەماندا کەوتەڕێ.. کە باوکم گەڕایەوە.. هەر ئەو ڕۆژە سەربازەکان ئابلۆقەی دێی ((خێچە)) دەدەن.. ئەوانیش وەکو زۆر جێگای تر کۆیان دەکەنەوەو دەیانکوژن..

م. چ: پێشتر گوتت، لە دایکەوە باپیرت لە ((سوربیانی))یەکان بوو، ئەوان لەگەڵ ئێوەدا، ناخۆشییان هەبوو.. باسی ئەو مەسەلەیەمان بۆ ناکەیت و کەمێك ڕوونی ناکەیتەوە؟.

- کەی بووە، نازانم. بەڵام بە مەزەندە ١٨٨٠-١٨٨٥ بووە.. ڕۆژێکیان لە نێوان ئێمە و سونییەکاندا شەڕ و پێکدادان دەقەومێت.. هەندێك دێی ئەوان دەسووتێنرێت. لە سوربیان تورکە سونییەکان دادەنیشتن.. ماڵەکانیان دەسووتێنن، کاتێك دێوەخانی ئاغای دێکە گڕ دەگرێت. پاشا ئاغا تەماشا دەکات دیوەخانەکە خەڵکی تێدایە و ناتوانن دەرچن.. دەستبەجێ دەڵێت: جاجم بێنن لە خوارەوە دەیگرن، پیان دەڵێت خۆتان هەڵدەنە سەر جاجمەکە.. کۆمەڵێك کەس، بەو جۆرە ڕزگاریان دەبێت، ٤ ژن و شەش منداڵ بەو جۆرە ڕزگار دەکات.. منداڵەکان چواریان کچ دەبن.. باپیرم ئەو ژن و منداڵانەی بۆ لای خۆی هێنابوو.. ماوەیەکی زۆر لای باپیرەم دەمێننەوە. دواجار پێیان

دەڵێت: ئێوە شوێن و جێگای خۆتان هەیە، گەر دەتانەوێت دەتانگەڕێنمەوە جێگاو ڕێگای خۆتان، ئەگەر ناتانەوێت ئەو ئێوە وەکو منداڵی خۆم بەخێوتان دەکەم.. کچەکان گەورە بوون، وتووبوویان: تۆ باوکایەتیت بۆ ئێمە کرد، لێرەدا گەورە بووینە، ئەگەر ڕازی دەبیت لێرە دەمێنینەوە.

بەو جۆرە، لە دێکەی ئێمە دەمێننەوە، یەکێك باوکم لە کچەکان دەخوازێت، ئەوی دیکەیان شوو بە مامم دەکات...

م. چ: لە خێزانەکەی ئێوە، ((وەلی)) ناوێك هەیە، گۆرانی و لاوکیان بە سەردا وتووە، چی لەبارەی ئەوەوە دەزانیت..

- بەڵێ، وەلی بەگ.. وەلی بەگ و باپیرم ئامۆزان.. وەلی، کابرایەکی ئازاو لێهاتوو دەبێت، لەگەڵ بەگەکانی ((چارسەنجاق))دا، نێوانیان باش نابێت، گەلێك جار شەڕیان لە نێواندا بەرپا بووە.. ((حاجی عوسمان)) کە یەکێك لە بەگەکانی ((چار سنجاق)) دەبێت، پیاوی دەوڵەت بووە، ماڵ و سامانێکی زۆری دەبێت، سەربازیش پشتیگری ئەوی دەکرد.. بەڵام نەیتوانی زەرەر و زیان بە ((وەلی)) بگەیەنێت.. لە دواییدا حاجی عوسمان بەگ، دۆست و خزمانی کۆدەکاتەوە و لەم بارەیەوە پرسیان پێدەکات، ئەوانیش پێی دەڵێن. ((بەزۆر و بە شەڕ هیچت بۆ ناکرێت.. ئەگەر دەتوانیت پلانێکی بۆ دانێ و دەستی لێ بوەشێنە..))

لەلایەکی ترەوە، لە سوریاوە، ئەسپێکی بۆ هاتبوو، ئەسپەکە کەس نەیدەوێرا سواری ببێت و لێی نزیك بێتەوە، پێیان دەگوت ((ئەسپە شێتە))، پێیان گوتبوو، وەلی بۆ ئاشتبوونەوە دەعوات بکە و دواجار ئەو ئەسپەی بەدیاری بدەرێ.. مەگەر ئەسپەکە پارچە پارچەی بکات...

حاجی عوسمان بەگ هەر وادەکات.. خەبەری بۆ دەنێرێت، کە لە دیوەخانەکەیدا دەعواتە.. ((ئیتر بەسیەتی، با ئاشت ببینەوە..)) ئاوا خەبەری بۆ دەنێرێت.. وەلی بەگ، لەگەڵ پازدە سواردا دەبنە میوانی حاجی عوسمان.. لەلایەکی ترەوە، هەر لەوکاتەدا، کابرایەکی (لاز) لەلایەن شێخ حەسەنەوە، دێت بۆ ڕمبازیی ئەسپ، کابرای

لاز لە سواری ئەسپدا کەم هاوتا دەبێت.. وەلی ئاگادار دەکەنەوە، کە بێت و لەگەڵ کابرای ((لاز))دا رمبازێ بکەن. وەلی بەگ، لەپێشدا بۆ ((چارسنجاق)) دەڕوات و دەبێتە میوانی حاجی عوسمان بەگ. دوای نانخواردن ((حاجی عوسمان بەگ)) دەڵێت: ((وا هاتوویتە ئێرە.. ئێمە هیچمان بە لایقی تۆ نەبینی لەم ئەسپە بەولاوە.. هێشتا ((زین))مان نەکردووە، ئەگەر قەبووڵی بکەیت، پێشکەشی تۆی دەکەین..))، لەو کاتەدا ئەسپەکە لە تەوێلە دەردێنن.. کە دەریدێنن، دەحیلکێنێت، لەو دەمە، وەلی بەگ تەماشای دەکرد..، وەکو دەڵێن گوایە عوسمان بەگ ماوەیەك ئەسپەکەی لە تاریکیدا بەستبووەوە، تا بە تەواوی شێت بێت.. وەلی، بە حیلەی ئەسپەکە کەیف خۆش دەبێت.. هەڵدەستێت و دەڕوات بۆ لای ئەسپەکە.. بەدەستی خۆی زینی دەکات، ئەسپەکەش جووڵە ناکات، وەلی سواری ئەسپەکە دەبێت.. ئەسپ وەکو گوللە دادەپەڕێت.. وەلی روو لە چیا دەکات و لە چاو ون دەبێت...

ماوەیەکی بەسەردا تێدەپەڕێت، وەلی، دەنگ و باسی نابێت، حاجی عوسمان دەڵێت: ((وا دیارە ئەسپەکە وەلی پارچە پارچە کردووە..))..

حاجی عوسمان، هەوڵی دەدا، لای حکوومەت بە خراپەکاری دابنێت و هەوڵی ئیعدام کردنی دەدات.. ڕۆژێك، وەلی، لەبەردەم دیوەخانەکەیدا پەیدا دەبێت، کە دەچێتە ژوورەوە هەموویان سەریان سوڕدەمێنێ و دەپەشۆکێن.. وەلی، بە یەکێك دەڵێت، ئابڕۆ ئالیك بۆ ئەسپەکە ئامادە بکە...

مەسەلەی کوشتنەکەشی بەمجۆرە بووە: ڕۆژێك هەواڵ بڵاودەبێتەوە دەڵێن ((پیلوانییەکان)) هاتوونەتە سەر زەوییەکانی ئێوەو خەریکی جووت کردنن.. وەلی بەگیش، سواری ئەسپەکەی دەبێت، دەڕوات بزانێت مەسەلە چییە.. تومەز ((خدێ)) لە خوار گردێکەوە خۆی ئامادە کردووە، نزیك دەبێتەوە، تەقەی لێ دەکات، هەر لەوێدا دەمرێت.. دایکی جلی ڕەش لەبەر دەکات و بە هۆزەکانی دەرسیمدا دەگەڕێت.. چەند جارێك دەچنە سەریان، چەند دێیەکیان دەسووتێنن..

## ٣٨ هەرەسێك بوو هات ئێمەشی گرتەوە

عەلی حەیدەر: خۆتمان پێ بناسێنە؟

وەلی: ناوم ((وەلی))یە، لە ناسنامەی فەرمیدا ناوم ((تونجای))ە من لە نەوەی، سلێمان ئاغام و لە هۆزی ((یووسفان))ین، خانەوادەکەمان بە ((مۆرتێ ئوجی)) ناسراوە.. ئێستا ئاغایەتی نەماوە، بەڵام لە کۆنەوە ئێمە لە ئاغاکانی ((یووسفۆ))ین.. باپیرەم سلێمان ئاغا، حەوت کوڕ و سێ کچی هەبووە..

عەلی حەیدەر: ساڵانی ١٩٣٧-١٩٣٨ز، هەندێك ڕووداو قەوماوە.. ئێوە چیتان بینی.. لەو ڕووداوانەدا هیچتان بەسەرهات؟

- بەڵێ.. گەلێك نەهامەتیمان بینی.. پیاوە بە تەمەنەکانمان دەیگێڕنەوە: ((٣٨ هەرەسێك بوو هات ئێمەشی گرتەوە...)) لە ٣٨ هەر یەکێك لە خێزانەکەمان دەستیان کەوت کوشتیان.. من لە ٣٨ منداڵ بووم، هیچی ئەو ساڵانەم لە یاد نییە.. بەڵام دایکم هەموو جارێك باسی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانەی بۆ دەکردین.. خەڵکانی دیکەش لەو بارەیەوە هەبوون باسیان دەکرد.. هەموو جارێکیش باسی بەسەرهاتی ئەو ژنەیان دەگێڕایەوە کە لە دێی ((دولدولە)) سەرباز بە نێزە سکی ژنێکی بارداریان هەڵتلیشاندووە و منداڵەکەی سکی بەدەم نێزەکەوە دەرچووە... ئەو ژنە کچی ((قەمەر ئاغا)) بووە، یانی کچی برای ئەو ((فندك)) ئاغایە بووە کە ئیعدامیان کرد... ژنەکە ناوی ((خانم)) بووە و خێزانی ((عوسمان))ی مامم بوو...

عەلی حەیدەر: باسی سك هەڵدڕینی ئەو ((خانمە))مان بۆ بکە؟

- ڕۆژێك لەپڕ سەربازەکان دێنە دێکەمان، خێزانەکەمان کۆدەکەنەوە.. دەیانبەن بۆ ((مامەکی)). لە سەرووی ((مامەکی))یەوە، دێیەك هەیە پێی دەڵێن ((دولدولە))، کە دەیانبەنە ئەوێ ((خانم)) ژانی منداڵ بوون دەیگرێت.. ناتوانێت ڕێ بکات.. هەرچەند زۆری لێدەکەن ناتوانێت ڕێ بکات.. سەربازێك نێزەیەك بە سکیا دەکات و لە بەرزاییەکەوە فڕێی دەدەنە خوارەوە.. کە نێزەکە بە سکیا دەکەن، منداڵەکە لە سکییەوە دەردەچێت.. ئێستەش

هەرچەندە ڕێمان بکەوێتە ئەو شوێنە دەگرین.. کە خانم دەکوژن، ئەوانی تر بەرەو ((مونزور)) دەبەن، لەوێ لەو شوێنەی ڕووبارەکان یەك دەگرن هەموویان دەکوژن.. هەر لە خێزان و خزمانی ئێمە ٨٥ کەس دەکوژن.. کە دەڵێم خێزانەکەمان: سلێمان ئاغا و براکانی قەمەر ئاغا و ئیسماعیل ئاغا و جافەر ئاغا لەگەڵ خێزانەکانیاندا مەبەستمە..

عەلی حەیدەر: باوکت ناوی چی بوو؟

- ناوی ((قەمەر)) بوو.

عەلی حەیدەر: ئەو کەی کوژرا؟

- دوای ساڵی ٣٨ کوژرا.. وابزانم ساڵی ١٩٣٩ز بوو. ئەوکاتە ئێمە لە گوندی ((چان چورە)) بووین، کە سەر بە ((مازگیرد))ە، ئەوێ دێی باپیرەم ((ئەیوب ئاغا)) بوو، کە باوکی دایکمە و لە هۆزی ((سوران))ە،.. کابرایەك هەبوو بەناوی ((عەلی قۆچ)) دێکەی ناوی ((قالیچی)) بوو، هەردوو دێکە لە یەکەوە نزیکن. عەلی قۆچ، لە گەورەکانی ((قوروشان))ە، خالۆم کچی ئەوی خواستووە.. دوای ساڵی ١٩٣٨ز، دەوڵەت زانی ئێمە لەوێداین، جەندرمە کەوتە پرسیارکردن، عەلی ئاغا و ئەیووب ئاغا، نەچوونە ژێر ئەوەی ئێمە لەوێین و ئینکاریان کرد، دەیانگوت ((چوونەتە چیاکان)).. بەمجۆرە ماوەیەکمان گوزەراند، لە دواییدا ڕۆژێکیان لە سەرووی ((قلاجی))یەوە، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((وەلی کاسێ))، سێ ئەسپ سوار پەیدا بوون، باوکم ئەو دەمە لەگەڵ چەند کەسێکدا لە دێکەدا دەبن.. کە سەربازەکان نزیك دەبنەوە، دایکم لە باوکم دەپاڕێتەوە.. ((عەلی ئەفەندی، ڕەهبەر شێخ سلێمان، شێخ حوسێ، وا لە دارستانەکەی (دەرێ تەختی)دان، تۆش بڕۆ لەوێ خۆت بشارەوە، کە سەربازەکان ڕۆیشتن بگەڕێرەوە..)).. ئەویش دەڵێت ((نەخێر ناڕۆم..)).. جەندرمەکان دەگەن و لەژێر دارتووەکاندا دادەنیشن و دەپرسن: ((قەمەر کێیە))؟.. ئەوانەی لەوێ دەبن تەماشای یەکتر دەکەن، بەڵام هیچ ناڵێن.. جەندرمەکان پرسیارەکە دووبارە دەکەنەوە.. باوکم دەڵێت ((قەمەر ئاغا منم..)).. یەکێك لە جەندرمەکان دەڵێت ((قەمەر ئاغا بڕۆ جلەکانت لەبەرکە، دەڕۆین بۆ (مازگیرد)..)) بە ئاشکرا پێی ناڵێن، لێرە بڕۆ و دوورکەوەوە...

بەڵام باوکم ڕاناکات.. دایکم دەکەوێتە سەر پای ((منداڵەکانت وردن، مەڕۆ..)) وای پێدەڵێت.. بەڵام دایکم هەرچەند دەکۆشێت، بە قسەی ناکات پێی دەڵێت ((نەخێر.. ڕاناکەم، ٨٥ کەسمان کوژراون من لەوان هیچم زیاتر نییە.. با منیش بکوژن..)).

دایکم بەرانبەر ئەم پێداگرتنەی باوکم، دەڵێت: ((هەرس هات و ئەوانەی برد، بەڵام تۆ ڕزگارت بوو، بۆ بەپێی خۆت بۆ مردن دەڕۆیت؟..))

جەندرمەکان دەیبەن، لە شوێنێکدا جەندرمەکان دادەنیشن پێی دەڵێن: ((ئێمە تا ئەو دێیە دەڕۆین، تۆ لێرە بە ئێستا دێینەوە!!)). مەبەستیان ئەوە دەبێت، باکم ڕابکات.. بەڵام ئەو چاوەڕێیان دەکات!! تا دەگەڕێنەوە..

بەو شێوەیە، دەیبەنە ((مازگیرد)).. بۆ دوو بەیانی خەبەر بۆ ئاوایی دەنێرن: ١٥ زێڕ بنێرن لێی خۆش دەبین... دایکم پارەکە پەیدا دەکات و دەیداتە دەستی موختاری دێکەوە.. بەڵام.. نازانم بۆ.. پارەکە ناگاتە دەستیان.. لەوێ دەیکوژن.. دایکم چەند کەسێك دەنێرێت، تەرمەکەی دێننەوە، لە ((چانچورە)) لای خێزانەکەی ئەیووب ئاغا دەینێژن..

عەلی حەیدەر: لە نێوان قسەکانتدا گوتت: عەلی ئەفەندی نێوانی لەگەڵ دەوڵەتدا باش بوو.. ئەی بۆ خۆی شاردەوە؟

- لە قەتلوعامەکەی ٣٨دا، جیاوازی نەدەکرا، هەر کێیەکیان بەردەست بکەوتبا دەیانکوشت.. ئەویش دەیزانی بیگرن دەیکوژن بۆیە خۆی شاردەوە..

عەلی حەیدەر: ئەی ئەو (قەمەر ئاغا)ی باوکی ئەو ژنەی سکیان هەڵدڕی، چی بەسەرهات؟

- ئا.. ئەویان بۆ ((بولۆ)) برد. لەوێ زیندانیان کرد.. کە ئەویان برد هێشتا ئەو ٨٥ کەسانەمان نەکوژرابوون.. بێ گومان ((قەمەر ئاغا)) مەراقی دەبێت و دەیەوێت بزانێت دەنگ و باس چییە.. نامە دەنێرێت، لە نامەکانیدا هەمیشە پرسیاری دەرسیمییەکان دەکات و سەڵاویان بۆ دەنێرێت.. لە ((مامەکی)) یەکێك هەبوو ناوی ((سلۆ)) دەبێت، ساز دەژەنێت و گۆرانی دەڵێت.. ئەو ((سلۆ))یە، نامەکانی بە گۆرانی دەکات و بڵاودەبێتەوەو دەکەوێتە زارات..

{لێرەدا چونکی بە شێوەزاری زازۆیە.. بە پیتی لاتینی وەك خۆی دەینووسمەوە.. چونکی شارەزای زاراوەکە نیم، تا بە دروستی بیهێنمە سەر پیتی عەرەبی-ئەحمەد-}

Amnon o, amnon o

Axaye mi rozu Seme yo

Qemer Axayi mektuve yazmis kerda

Vano Qomo, oli kene

Xortone mi ra kam wes o, kam merd o?

Ale use zengi mekluve yazmis keno

Vano, "Apo to re merax nebo

Torge Sano gile koye suri Laser amo qonaxe to berdo

Abdula pasayi lardi arda werte xortune to Heq boa z ware to de neverdo

Axdad o, Axdad o, Axdad o

Axaye mi sono Qeraz o

Taye xorti Ce usiv Axayi de rest era Heq zono ke baxede rez o

Silo sur Qemer Axayi re selam keno Vano "Axaye mi qarse Findiqi mebe Di-re roji kemere Cile de tifong berzo"

عەلی حەیدەر: قەمەر ئاغا، کەی چ ساڵێك مرد؟

- باش لە یادم نییە.. ١٩٤٠ یان ١٩٤١ز گەڕاینەوە دێکەمان ((پەگو)).. ئێمە لەوێ بووین، قەمەر ئاغا نامەی بۆ براکەی ناردبوو: ((بڕۆ بۆ ئاخداد هەردوو مەزراکەم بەکرێ بدەن، پارەکەی وەرگرە و وەرە بۆ لام.. چونکی وەکالەتم داوە هەموو زەوی و زارەکەم بەناوی تۆوە بکەم)) پاخ، ئاخداد، پلوانگ، وارانیە، پاگو، لیلو، هەرچك، تولك هەمووی پێکەوە...

لەلایەکی ترەوە، قەمەر ئاغا، کچەکەی دایە یەکێك لە کوڕەکانی ((ئاغا))، ئەو خانەوادەیەش بیانی نەبوون، لە ئێمەن.. نامەکەی نارد، برا گەورەکەم مەزراکانی بەکرێ دا.. بۆ ئەمە چووە ئاخداد، ئەوان ڕازی نەبوون ((چۆن شتی وادەکەن)) وایانگوتبوو.. ((کچی قەمەر ئاغا بووکی ئێمەیە بۆیە عایدی ئێمەیە... بەمجۆرە بەکرێدانەکە ڕێك نەکەوت.. دوای ئەمە، قەمەر ئاغا مرد.. وابزانم ساڵی ١٩٤٣ز بوو یان ١٩٤٤ بوو.. ڕۆژێکیان پەزەکانم بۆ لەوەڕگا بردبوو، کە گەڕامەوە، بینیم دایکم دەگری، کاکیشم زۆر غەمبارە.. پرسیم چی بووە؟ دایکم وتی ((قەمەر ئاغا مردووە..)).

من نەمدەزانی، قەمەر ئاغا کێیە.. پرسیم وتیان ((قەمەر باپیرتە..)) خەڵکی دێکە هەمووی کۆببووەوە.. دایکم خواردنی کردبوو و دەیبەخشییەوە..

عەلی حەیدەر: گۆڕەکەی قەمەر ئاغا لە ((بولو))یە؟

- بەڵێ لەوێیە..

ئێستاش لە کوڕەکانی دوو نەوەی ماوەتەوە، کچەکەشی منداڵی هەیە...

عەلی حەیدەر: وەکو بیستوومە، خێزانەکەتان لەکاتی قەتلوعامەکەدا هەندێکیان ڕزگاریان بووە، دواجار بە دەستی یەکێك لە خۆتان کوژراون ئەمە چۆن بوو؟ ڕاستە؟.

- بەڵێ.. ئەوەش ڕووی داوە.. لەپێشدا دەمەوێت ئەوە بڵێم:

بەر لە ساڵی ١٩٣٨ز قەمەر ئاغا هەر لە دیوەخانەکەیدا قوتابخانەیەکی داناوە، منداڵان دەچوون لەوێ دەیانخوێند.. هی حکوومەت نەبوو، قەمەر ئاغا لە کیسەی خۆی دایینابوو.. ڕووداوەکەش ئاوابوو: هەرچی خزمانی ئێمە هەبوون سەربازی تورك کۆی کردبوونەوە، هەموویانیان بردبووە نێوان هەردوو ڕووبارەکە، لەنێو سەربازەکاندا ئەندازیارێك دەبێت، چەند ساڵێك لەوەوبەر لەماڵی قەمەر ئاغا مابووەوە. خزمانی ئێمەی دەناسی، بەهۆی ئەو ناسیارییەوە کەفالەتی ٤-٥ کەسیان دەکات و ڕزگاریان دەبێت.. یەکێك لەوانە کە ناویانم لەبیرە کوڕەکەی قەمەر ئاغا دەبێت، یانی براکەی ((فندق)) ئاغا بوو.. ناوی ((مەمەد)) بوو.. لەگەڵ جافەری مامی مەمەد و مام حەسەن و ئیسماعیل کوڕی ئاغا.. کوڕەکەی قەمەر ئاغا ((مەمەد)) لە ئەستەنبوڵ دەیخوێند لەوکاتەدا لەوێ دەبێت.. بەو جۆرە ئەوانە ڕزگار دەبن..

لەنێوان خۆیاندا دەڵێن: ((بۆ کوێ بڕۆین، چی بکەین؟)).. لە دواییدا مەمەد ئێژێت: دەچینە ماڵی ئاوەڵ زاواکەم، کە کوڕی مەمەدی مورسایێ دەبێت.. ئەوانەش هەر خزمانی ئێمەن.. ئەوانە پێیان دەڵێن ((ئیسماعیلییەکان)).. مەمەدی مورسایی، کابرایەکی میوان دۆست و خاوەن دیوەخان بووە، لە نێوان خەڵکیدا ڕێزی لێ دەگیرا.. دەچنە لای مەمەدی مورسایی.. شوێنێك هەیە پێی دەڵێن: ((دەرێ چەسەمیرە))، لەوێ بۆ ئەوەی نەکەونە بەرچاو، خانوویەك لە قوڕ دروست دەکەن و تێیدا دادەنیشن، خواردنیان لەلای ((مەمەدێ))وە بۆ دەچوو.. هەموو ڕۆژێکیش بە سەری دەکردنەوە..، دوای ٤-٥ ڕۆژێك، مەمەدی مورسایی، لە سەربانەکەیاندا خەریکی دووکەڵ کێشەی ماڵەکەیان دەبێت، تەماشا دەکات، لە حەوشەدا شڵەژاون و بارودۆخەکەی بەدڵ نابێت.. کچەکەی لە خوارەوە پێی دەڵێت: ((چ دەکەیت بابە؟)).. ئەویش دەڵێت: ڕۆڵە خواردنتان بۆ میوانەکان نارد؟.. کچەکەی دەڵێت: ((باوکە کوڕەکەت میوانەکانی بەدەستەوەدان..))

بێ گومان ئێمە ڕاستی ئەم ڕووداوە نازانین، خەڵکی وا دەگێڕێتەوە.

عەلی حەیدەر: کوڕەکانی قەمەر ئاغا کەسیان ڕزگاریان نەبوو.. وانییە؟

- نەخێر.. کوڕەکانی نەمان.. بەڵام هەردوو کوڕەکەی مەمەد ڕزگاریان دەبێت.. ئەوانە کە ڕەوانەی ((ئەلازیك))یان دەکەن، کچەکەی ((فندق ئاغا)) لەوێ دەبێت.. چونکی، لە شوێنێکدا پێکەوە نەبوو بوون یەکتریان نەدەناسی، نەیاندەزانی ئامۆزای یەکترن.. یەکێك لە منداڵەکانی مەمەد ناوی حەسەنە ئەوەکەی قەمەری ناو بوو. ئەو دووانەیان بۆ ڕۆژئاوای تورکیا ((تەرحیل)) دەکەن.. کچەکەی (فندق ئاغا) ناوی ((بەسە)) دەبێت دەچێتە ئەنقەرە، دواجار بۆ دەرسیم دەگەڕێتەوە.. لە دەرسیم یەکترمان ناسی.. ئەوانەش بۆ ڕۆژئاوای تورکیا ڕاگوێزران دواتر هاتنە دەرسیم و یەکترمان ناسییەوە.. ئێستا دێکەمان چۆڵە.. هەریەکە و کەوتینە جێگایەك.. هەردوو کوڕەکەی (مەمەد)یش ئێستا لە هۆڵەندا دەژین...

**یەکێکی وەکو عەلی گاخی گۆڕی نەبوو...**

مونزور چەم: خەڵکی کام ئاواییت؟

کازم: ئاوایی ((سووایيگە))ی سەر بە دەرسیم..

م. چ: خانەوادەکەتان لە دەرسیم کێیان پێ دەڵێن؟.

- ئێمە بنەماڵەی ((عەلی گاخی))مان پێ دەڵێن.. ئێمە لە کۆنەوە لە ((سوواییگە)) نەبووینە.. باپیرم دێی سواییگەی لە ئاغای ((یووسفییەکان)) لە کەمەر ئاغای کڕیوە.. باپیرەم نەچووە بۆ کڕینی، کەمەر ئاغا خۆی هاتووە و گوتوویەتی حەز دەکەین ((بێیتە لای ئێمە)) وای پێ گوتووە.. ئەوجا، باپیرەم چووە و دێکەی کڕیوە...

م. چ: یانی ئاوایی ((سوواییگە)) لە کۆنەوە هی کەمەر ئاغا بووە؟

- بەڵێ.. بەدەستی ئەوەوە بووە.. بەر لەویش بەدەستی کابرایەکی دەوڵەمەندەوە بووە بەناوی ((عەلیێ مەنقوڵی)).. ئەو کابرایە ئەوەندە ئاژەڵی زۆر بووە لە دێکە جێی نەبووەتەوە. شیری پەزەکانیشی ئەوەندە زۆر بووە، تاوێریان تاشیوە لە شێوەی حەوز و شیریان تێیدا کردووە بە پەنیر.. هەندێك لە مەڕ و ماڵاتەکەی دەبردە شوێنێك پێی دەڵێن ((گویگەرك)) لەوێ دار ((بی)) لێیە.. ئێستاش هەر بەناوی ئەوەوە ناسراوە.. ((دارییەکانی عەلیێ مانگولی)).. دەڵێن ئەو ئاواییە پێشتر، ئاوایی ئەرمەنییەکان بووە. چونکی لە زەوی و زاری ئەو ئاواییەدا مەزرایەك هەیە ناوی ((تەزی کلیسە))یە.. لەناو ئەو مەزرایەدا بەردێکی سپی گەورە هەیە، لەسەر بەردەکە   بە پیتی عەرەبی لێی نووسراوە، ئەوانەی شارەزان ئەو نووسینەیان خوێندووەتەوە:

{کاتێك جامێك گەنم بە سێ ئاقچە بووە، لە ماڵی عەلیێ مانقولی رۆژی سێ تەنەکە گەنم بە هەویر دەکرا و دەخورا..}

م. چ: باپیرە گەورەت ((عەلییێ گاخی)) بەر لەوەی بڕواتە ((سوواییگ)) لەکام دێ دەژیا؟

- لە ((نازمیە)) بوو.. دێی سەرەکی ((دەوا کورێسۆ)) بوو.

بەڵام ((دەرێ چێکەرو)) ((گێرێ)) ((سیموریك)) هەر هی ئەو بوون.. ئێمە خانەوادەی ((چێ گولینی))مان پێ دەڵێن.. دەروێش گولین باپیرە گەورەی ئێمە بووە.. لەوێوە نازناوی ((گولین))مان بۆ ماوەتەوە.

م. چ: یانی، ئێوە لە ((گولینانەکان))ن؟

- بەڵێ.. ئێمە لەوانین..

م. چ: باپیرت له زۆر جێگادا چەکی بەکاربردووە.. کاری سیاسی کردووە.. کەمێك لەم بارەیەوە بۆمان نادوێیت؟..

- بەڵێ: لەو لایەنانەوە جموجۆڵی زۆر بووە.. بۆ نموونە، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، سوپای ڕووس لە دەوروبەری ((پلەموریا)) تاکو ((سولەتولە)) هاتووە. ئەو چووە لەگەڵ فەرماندەی ڕووسدا وتووێژی کردووە. لێرەدا دەبێت بڵێم ((عەلیێ گاخی)) تورکی نەزانیوە، بەڵام زمان ئەرمەنی زانیووە، کە لەگەڵ ڕووسەکاندا قسەی کردووە، بە ئەرمەنی دواوە، وەرگێڕێکی ئەرمەنییان هێناوە، قسەکانی بۆ ڕووسی وەرگێڕاوە.. لەو چاوپێکەوتنەدا بە فەرماندە ڕووسەکەی وتبوو: ((ئێمە تورك نین.. ئێمە کوردین، لەگەڵ تورکەکاندا نێوانمان باش نییە، لەگەڵ ئەواندا لەشەڕ داین بۆیە بۆ دەرسیم نەیەن.. پشتی ئێمە بگرن.. چەکمان بدەنێ تا لە جەوری تورك ڕزگارمان دەبێت..)).. ڕووسەکان چەك و فیشەکیان دەدەنێ.. یەکێك لە هۆکاری قەتلوعامی ئێمە ئەو یارمەتیدانەی ڕووسەکان بوو. لەلایەکی ترەوە کێشەی ((زازا))کان لە ئارادا بوو.. نازانم چی کاتێك دەبێت، بەڵام ((عەلی گاخی)) سەردەمانێك خەڵکی کۆکردووەتەوە و بەرانبەر ((زازا))کانی دەوروبەری ((پالو)) ڕاوەستاوە.. گەلێك جار باسی ئەمەش کراوە.. ئێمە و ئەوان هەر یەکێکین، زاراوەی قسەکردنمان یەکە، بەڵام نێوانمان باش نییە و حەزمان لێیان نییە.. خەڵکی دەڵێن ((ئێمە کرمانجین)) ئەوان ((زازا))ن... من ئەمە بۆ جیاوازی (مەزهەب) دەگەڕێنمەوە کە لە نێوان ئێمە و ئەواندا جیاوازی هەیە...

م. چ: باشە، دواجار ئەم کێشەیە بەچی گەیشت؟

- چەند جار شەڕ و پێکدادان لە نێواندا قەوماوە..

م. چ: دەڵێن، گوایە بۆ ئەوەی لە دەرسیم پێکەوە ڕاپەڕن ((شێخ سەعید)) چووەتە ماڵی ((عەلیێ گاخی)).. بەڵام ڕێك نەکەوتوون.. لەم بارەیەوە چیت بیستووە؟

- نەخێر.. نەهاتبووە ماڵی ئێمە.. وەکو گوێم لێ بووە، چوو بووە ماڵی ((سەید ڕەزا))، بەڵام بەڕاستی نازانم ئەو مەسەلەیە چۆن چۆنی بووە و تا چەند ڕاستە نازانم.

م. چ: لەم ماوەیەدا ((شێخ سەعید)) گوایە چووەتە ماڵی مستەفا بەگی چارەکان یان لە ((چەمیٚ سەید خانۆ-چەمی قوتو)) لەگەڵ نوێنەرانی هۆزەکانی دەرسیمدا پێکەوە دانیشتوون، لەم بارەیەوە چی دەزانی؟

- نازانم.. لەبارەی ئەو چاوپێکەوتنەی شێخ سەعید هیچ نازانم.

م. چ: لەنێوان هۆزی ((شێخ حەسەنان)) و ((قورێشان))دا شەڕ بەرپا بووە.. ئەی لەو بارەیەوە چی دەزانی؟.

- بەڵیٚ.. باسی ئەمە کراوە، گوێم لیٚ بووە.. کوڕی ((عەلی گاخی)) ڕۆژێکیان بۆ ((ئەلەزیز)) دەڕوات، لەولاوە کە دەگەڕێتەوە، لە ((پیٚرتاگە)) تیٚدەپەڕیٚ دەگاتە شوێنێك پێی دەڵێن: ((مەرگا شێخی)) کۆمەڵێك چەکداری ((ئاواسانلی)) ڕێگەی لیٚدەگرن. هەرچی پیٚ دەبێت لێی دەسێنن.. ئەمیش خۆی پێیان دەناسێنێت، من فلاٚنە کەسم کاری وامەکەن.. دواجار لەژێر ئەم کارە دەرناچن وایان پیٚ دەڵێت... بەلاٚم ئەوان گوێی پیٚ نادەن.. دوای ئەو ڕووداوە، هەندێك لە عەشیرەتەکانی دەرسیم یارمەتی ((عەلییٚ گاخی)) دەدەن، هێرش دەبەنە سەر دێکانی ((شێخ حەسەنان)).. دێی ((هەلڤوری)) دەسووتێنن.. سەید ڕەزا، بۆ ئاشتبوونەوەیان، هەرچییان بردبوو دەگەڕێنێتەوە، دوای ئەوە ئاشت دەبنەوە..

م. چ: با کەمێك لەسەر ڕووداوەکانی ١٩٣٧-١٩٣٨ز ڕاوەستین.. وەك من ئاگادارم، باپیرە گەورەت، لەگەڵ (سەید ڕەزا)دا، لەگەڵ هەندێك لە سەرەك هۆزەکان کۆبوونەتەوە، پەیمانیان بەیەك داوە و سوێندیان بۆ یەك خواردووە..؟

- بەڵیٚ.. ئەوە کراوە..

م. چ: باپیرت، دوای ئەوە چی کرد؟ لەگەڵ دەوڵەتدا ڕووبەڕوو بووەوە؟

- بەڵیٚ.. بەڵیٚ شەڕی حکوومەتی کردووە.. پیاوەکانی خۆی ناردووە و قەرەقوڵی ((پاخ))یان سووتاندووە...

م. چ: دوای ئەوە؟

- لە ساڵی ١٩٣٨ز، تەماشا دەکەن، بارودۆخەکە زۆر خراپە، ((عەلییٚ گاخی)) بۆ خۆپاراستن لە ماڵ نامێنێت.. ڕۆژێك دەگەڕێتەوە ماڵیٚ، سەربازەکان دەورەی ماڵەکەی دەدەن.

عەلی و هەندێك لە خێزانەکەمان دەکەونە بەردەستیان دەیانبەن.. لەو هاتنەیاندا، کە ماڵەکە دەپشکنن بەڵگەنامەیەکی ((عەلیێ گاخی)) و رووسەکان دەدۆزنەوە...

م. چ: بۆ کوێیان دەبەن؟

- ((وەلیێ سلێمانۆ)) و ((تەختی خەلو)) تێدەپەڕن و بەرەو ((مازگرت)) دەیانبەن.. لە خوار ((مازگرت))ەوە شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((مەرگا شێخۆ)) دەگەنە ئەوێ و ناگەن دەست بە ئەشکەنجەدانی عەلی دەکەن، سووکایەتی پێ دەکەن دواجار هەر لەوێدا، سێدارە هەڵدەخەن و ئیعدامی دەکەن. بە خەڵکەکەی ئەو ناوانە دەڵێن: نابێت کەس لاشەکەی هەڵگرێت و نابێت بینێژن.. تا چاوی خەڵکەکەی پێ بشکێنن و نائومێدی بخەنە دڵیانەوە.. لەو کاتەدا قائیمقامی ((مازگرت)) ((فەخری توقماق ئوغلو)) بووە... کاتێکیش لە ماڵ دەریانکرد بوو، وتبوویان ((تەرحیل))تان دەکەین..

م. چ: نێژرا..؟ ئەگەر نێژرا گۆڕەکەی لە کوێیە؟

- بەداخەوە.. یەکێکی وەك ((عەلی گاخیێ)) گۆڕی نییە..

م. چ: لە خێزانەکەی ئێوە کەسی دیکە کوژرا؟

- باوك و دایکم نەبێت هەموویان کوژران.. دایکم و باوکم لەو کاتەدا لە ماڵی باپیرەم- باوکی دایکم- بوونە و نەکەوتنە بەردەستیان..

م. چ: عەلیێ گاخی، چەند منداڵی هەبوو؟

- یەك کوڕی هەبوو، ناوی حسێن بوو، لە ١٩٣٨ کوژرا.

م. چ: کوڕەکەشیان لە مازگرت گوشت؟

- نەخێر.. لە ڕێگای دەرسیم کوژرا..

م. چ: دایکت لە کام هۆزە؟

- باوکی دایکم ((ئۆسێنیێ بیرمۆ))ی پێ ئێژن.. لە نەوەی ((هادی قەری))یە، ئەویش ((قوریشانلی))یە.

م. چ: سەردەمێك ئەرمەنییەکان لە دێکەتاندا دەژیان، لە ڕۆژگاری باپیرت ئەرمەنییەکان هەر لەوێ بوون؟.

- بێ گومان.. ئەو دەمەش هەر لەوێ بوونە.. هەر لە کۆنەوە نێوانی ((عەلیێ گاخی)) و ئەرمەنییەکان زۆر باش بووە.. لە کاتی کۆمەڵکوژییەکەی ئەرمەنییەکاندا لە شوێنەکانی تر تووشی ئەزیەت و کوشتن بوونەوە، بەڵام لە دەرسیم هیچی وا ڕوینەدا..

م. چ: ئێوەیان چ ساڵی ((تەرحیل)) کرد؟

- دوای ساڵی ١٩٣٨ز، لێبوردن دەرچوو بوو.. ئەوەی تەسلیم دەبوو نەیاندەکوشت تەرحیلیان دەکردن... باپیرم-باوکی دایکم- بە باوکمی گوت ((وەرە تەسلیم ببە هیچت لێ ناکەن، ئەم هەمووماڵ و موڵکەت هەیە تاکەی وا دەمێنیتەوە.. مەترسە من لەگەڵتام)). باوکم خۆی تەسلیم کرد، ئێمەیان تەرحیل کرد.. من لەوێ لەدایك بوومە. باوکیشم هەر لە غەریبی ساڵی ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.. باپیرەم هاتە لامان.. دایکم ناوی ((کیوارە))یە.. سێ براین.. خوشکمان نییە...

### دووبەرەکی پشتی دەرسیمی شکاند

حوسێن یڵدرم: هەرچەندە من لە نزیکەوە دەتناسم، بەڵام لە پێشدا خۆت بناسێنە؟

کازم گوێدەر: ناوم کازمە، سەر بە عەشیرەتی ((سمکۆ))ین، باوکم ((شێخ حەسەنی)) ناوە.. باپیرانم.. باپیرە گەورەم ((زەکەریا ئاغا))یە.. دوای ئەو ((یووسف ئاغا)) و دوای ئەویش ((کاکی ئاغا)) ئەمجا ((سلێمان ئاغا)) دێت.. سلێمان باپیرەمە.. دایکم کچی ((ئیدارە ئیبراهیم))ە، ئەویش کچە ئاغا بووە.. ئیدارەی ئیبراهیم ئاغا، لە بەگەکانی هۆزی ((قۆچان))ە، لە دەرسیم هەموو کەسێك ناوی بیستووە و دەیناسێت.. ئیدارە ئاغا، سێ کوڕی هەبووە، یانی دایکم سێ برای هەبوو ((سەید خان، لیل، جەمشید)) هەرسێ خاڵۆکانم کۆچیان کردووە، ئەوانیش وەکو باوکیان خاوەنی ناو و ناوبانگ بوونە و سەریان بۆ کەس شۆڕ نەکرد تا لە ژیاندا بوونە.. من خۆم ٧٢ ساڵ تەمەنمە، بە کورتی هەندێك ژیانی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.. ١٤ ساڵان بووم باوکم مرد، لە کۆمەڵکوژییەکەی ١٩٣٨ز گەلێك کەس کوژرا. لە ساڵی ١٩٣٨ز وای دەگێڕنەوە کە ٣٨ هەزار کەس کوژران، لەوانە براکەی من و باوکم سەربازەکان کوشتنیانن. ئەوەشی نەکوژراو مایەوە ((تەرحیل)) کرا.. ئێمەیان بۆ ((ئورگوپ)) کە سەر بە قەیسەرییە، گوێزایەوە.. خاڵۆکانیشم بۆ ((بورصە)).. دە ساڵ لە غەریبیماینەوە.. دوای دە

ساڵ فەرمان دەرچوو بۆ شوێنی خۆمان بگەڕێینەوە.. گەڕاینەوە دێهاتە وێران و سووتاوەکانی خۆمان، سەرلەنوێ ئاوەدانمان کردەوە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییەدا، دەوڵەت جارێکی کە لە زێدی باوباپیرانی خۆمان دەریکردین {ئەمە لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابورووددا بوو-ئەحمەد-} . جارێکی تر دێکەمانیان سووتاند و ڕووخاند.. ئێستا هەریەکە و لە شوێنێکین.. هەندێکمان لە ئەڵمانیا دەژین، هەندێکمان لە ئەستەنبوڵ و بەشێکی ترمان وا لە ((ئەلازیگ)) دان..

کە لە ساڵی ١٩٣٨ز، لەشکری تورك هێرشی کردە سەر ناوچەکەمان، دەست بەجێ دێکەمان چۆل کرد و چووینە چیاکان.. شوێنێکی دیارمان نەبوو، ڕۆژێك لێرەو سبەی لەوێ.. دواجار ڕوانیمان بەم جۆرە ناگوزەرێت، مانەوەمان لە دەوروبەری ((عەلی بوغاز)) زەحمەت بوو.. لەگەڵ خاڵۆکانم و هەندێك خێزانی دیکەدا بەرەو دەوروبەری ((واجوخە)) کەوتینە ڕێ، چووینە ناوچەی ((قەڵان)) کاتی تۆو کردن بوو، کە زستانیش هات، پیاوەکان گەڕانەوە دێکان.. ژنان و منداڵانی ساواو بچووك لەوێ مانەوە.. چوار ڕۆژ ئێمە بەڕێوەبووین، لەسەر ڕێگاماندا، هەندێك خانوو نەڕوخابوون دانیشتووانەکانیشی نەڕۆیشتبوون، بەڵام زاتمان نەکرد بە میوانیان ببین، لەلایەکەوە نەدار و هەدار بوون، لەلایەکیشەوە لە سەربازەکان دەترساین جێگاکانمان پێ بزانن، جا دەبینە هۆی کوشتنی ئەوانیش.. بە ڕۆژ بەو بەفر و سەرماو تۆفە، خۆمان لە پەنایەك دەدا، شەو بەڕێکەوتین.. سێیەمین ڕۆژ ((لیل)) و ((جەمشید))ی خاڵۆم، پایان بەفر بردی.. هەروەها پای کاکیشم بەهەمان دەرد چووبوو، ئەم برامە ((خالید))ی ناوبوو، لە دایکەوە براین.. لە چیای (باڵکانی)ماینەوە. مانگێك هەر لەوێ ماینەوە، دەوڵەت خەبەری پێگەیشتبوو کە ئێمە لەوێداین خەبەریان بۆ ناردین کە لێبوردن دەرچووە..

((لیل))ی خاڵۆم، کوڕێکی هەبوو ناوی ((یادۆ))، هەردووکمانیان بۆ ((ئەلازیز)) هەنارد، لەوێ چوونە لای ((عەبدوڵڵا حوسێن ئەلب دۆغان)). ئەوەیان پێ ڕاسپاردبووین گەیاندمان. ئەویش سوێندی شەرەفی خوارد کە لەلایەن سەربازەکانەوە هیچ خراپەیەکتان تووش نابێت.. ئێمەش گەڕاینەوە، عەبدوڵڵا پاشا چی پێ گوتبووین گێڕامانەوە.. بەمجۆرە گەورەکانمان ڕۆیشتن

و بڕیاریان دا خۆیان بەدەستەوە بدەن.. خەبەریان بۆ ((خۆزات)) هەنارد، تابوورێك سەرباز هاتن، ئێمەیان بۆ ((هۆزات)) برد.. خاڵۆکانم پایان بەفر بردبوونی بە وڵاخ گواستنیانەوە..

یەتەرە: لەگەڵ ئەوەی مابوونەوە، بۆ کوێ رۆیشتن؟ لەکوێ مانەوە؟ ئەمەمان بۆ باس بکە..؟

- ئێمە لە ((چەمێ ئارەبی)) ماینەوە، سەربازەکان هاتن و ئێمەیان برد لە هۆزات بە دهۆل و زورنا پێشوازییان لێ کردین.. دەوڵەت ئەوەی سازاندبوو.. دوو سێ رۆژ لەوێ ماینەوە، منیان نارد تا ژن و منداڵەکان بهێنم، چوومە ((کالان))، ئەوانی ستریان بۆ ((ئەلازیگ)) نارد، لە مایس تەرحیلیان کردن.. بەیەکەوە نەیانناردن بڕ بڕ ناردنیان.

حوسێن یلدرم: وتت مامە ((لیل)) زامدار بوو، لەکوێ زامدار بوو؟ ئەی باوکت و براکانت لەکوێ بەرکەوتن؟

- باوکم و براکانم لە ((قزل وێران)) زامدار بوون.. ((لیل))ی خاڵۆم لەو کاتەدا زامدار بوو کە ماڵمان بەجێ هێشت لە ((کێوی مۆری-چیای ماران-)) زامدار بوو.. بەر لە ئێستا وتبووم، سەرباز لە هۆزاتەوە هێرشی هێنابوو بۆیە دێکانمان چۆڵ کرد. ئەو کاتە خاڵۆکانم ((سەید خان ئاغا و جەمشید)) لە دوامان هاتن وتیان ((مەڕۆن با پێکەوە بڕۆین))، بەڵام ئێمە رۆیشتین، وایان بە باش زانی بەجیا بڕۆین.. لە ((حەیدەر باوا)) گیرساینەوە، کە دەکەوێتە سەرووی ((قەرەباش))ەوە، خەڵکانی دیکانیش دێکانیان چۆڵ کردبوو و بۆ ئەم ناوانە هاتبوون، ئاپۆرەکەی ئەو ناوە لەوەدا نەبوو.. ((ئیسماعیلییەکان)) و ((رەسکانییەکان))یش لەوێ بوون.. دێکانیان بەجێ هێلابوو و هاتبوون، بە تەمابوون بڕۆنە ((کالۆ)) و ((کەچەڵان)).. لەم کاتەدا چەند کەسێك کوژران.. نێوان ئێمە و هۆزی ((پەزگەوران)) باش نەبوو.. هەڵاتنی ئێمەیان بە فرسەت زانی.. چەند کەسێکیان لێ کوشتن.

حوسێن یلدرم: ئەوانەی کوژران کێ بوون؟.

- موزێرێ حەسێ و کوڕەکەی، برایەکی ئیسماعیل وەلی.. ئەمانە لەو ناوە بۆ خواردن دەگەڕان، بە فرسەتیان زانی بوو کوشتبوونیان.. گەیشتینە ((کرەدوزو)) سەرباز ڕێگەکەی لێگرتین.. ئێوە دەزانن بەر لە ساڵی ١٩٣٨ز چەکی دێکانیان کۆکردبووەوە... تەقەیان لێ

کردین، هەر لەوێدا چەند کەسێکیان کوشت.. بەڵام ئێمە هەڵاتین، چووینە ((قەرەداشیە))، ئێوارە بوو، خۆر لە زەردەدا بوو برایەکم ئێستا تەمەنی چل ساڵ دەبێت، ناوی یووسفە، بەردەوام ئەو کاتە دەگریا.. سەربازەکانیش تومەزبە دوامانەوەن.. لەو دەمەدا دایکم وتی: بامن ئەم منداڵە دوور بخەمەوە...

باوکم دووربینێکی بەلاوە بوو، تەماشای ئەو ناوەی دەکرد.. لە دوورەوە کۆمەڵە کەسێکی بینی، بۆ لای ئێمە دەهاتن.. لە دوورەوە، هاواری کرد: ئێوە کێن؟ ئەوانیش وتیان: ئێمە لاچینییەکانین... ئێمەش چووینە لایان.. ئەوە نیو سەعاتێك تێپەڕی، تومەز سەربازەکان لە دوو قۆڵەوە نیازی لای ئێمەیان هەیە.. لە ((قزڵ وێران)) و ((سەروشمانە))وە دەورەیان گرتین..

یەتەرە: تۆ لای باوکت بووی؟

- بەڵێ..

یەتەرە: بە یەکیشەوە ڕاتانکرد؟

- بەیەکەوە هەستاین، باوکم بە دەستێکی قۆڵی منی گرتبوو، بەدەستەکەی تری براکەمی گرتبوو.. دوای ماوەیەك.. قۆڵی بەردام و خۆم دەستم بە ڕاکردن کرد.. لە دواوەش تەقەیان لێ دەکردین.. گەیشتینە دێی ((دۆخکۆ)).. چووینە ماڵی کابرایەك، خەتەنەی دەکرد لەو ڕاکردنەماندا لە دواوە تەقەیان لێ کردین، منداڵێك بەری کەوت و لەوێدا مرد..

حوسێن یڵدرم: ئەوەی خەتەنەی دەکرد ناوی چی بوو؟

- ناوی خدر بوو.. ئەو پیاوە کوڕێکی هەبوو ئێستا لە ئەستەنبوڵە هەر لەو ڕاکردنەدا، باوکم و براکەم زامدار دەبن لەوێدا جێ دەمێنن، سەربازەکان دێنە سەریان، سەری هەدووکیان دەبڕن و دەیبەن بۆ لای فەرماندەکەیان.. براکەم دە ساڵان بوو، ناوی یووسف بوو... لەوێ ((ئایدن ئاغا)) هەبوو، هەر لە کۆنەوە دۆستایەتیمان هەبوو، ئایدن ئاغا، پیاوێکی نارد منی بۆ لای خۆی هێنا، دوای ماوەیەك لەگەڵ پیاوێکدا گەڕامەوە لای خێزانەکەمان... دواجار ڕۆیشتین لاشەی بێ سەری باوك و براکەمان ناشت.. کابرایەك هەبوو ناوی ((عەلی حەیدەر)) بوو، ئەویش دوو منداڵی کوژرابوو.. عەلی حەیدەر، ڕەهبەری عەشیرەتی قۆچان بوو، دوو منداڵەکەی عەلی حەیدەر، یەکێکیان ناوی سەید ڕەزا بوو، کچەکەیان ناوەکەیم لەبیر نەماوە..

لەساڵی ١٩٣٨ز، هەندێك لە عەشیرەتەکان سەر بە دەوڵەت بوون، کە سەربازەکان هاتبوونە ئەو دەوروبەرانە، ئەوانە رایان نەکردبوو.. لە دێکانی خۆیان مابوونەوە.. بەڵام چەکیان نەبوو.. کەچی سەرەڕای ئەوەش سەربازەکان هەندێك لەوانیان برد و نەگەڕانەوە.

یەتەرە: ئەو کاتە هەواڵی دایکت دەزانی؟

- نەخێر.. کەس ئاگای لە کەس نەبوو.. لەو کاتانەی رامانکردبوو دایکم تووشی ژن و پیاوێکەوە دەبێتەوە بەناوی ((کەلسوم)) و ((ملیٚ ئیبراهیم)).. لەگەڵ ئەواندا رادەکات و لەو ناوە دووردەکەوێتەوە.. لەگەڵ ئەوماڵەدا دێنە شوێنێك پێی دەڵێن ((خانۆ))، لەویٚ دەچنە ناو دارستانێکەوەو خۆیان دەشارنەوە. بیٚ گومان برسێتی پەرێشانیان دەکات.. برا بچووکەکەم ((یووسف)) بە باوەشیەوە دەبێت.. بێجگە لە یووسف، دوو کچی منداڵیشی لەگەڵدا بووە. ئەو دوو کچە باوك و دایکیان دابڕا بوون.. هەر لەو کاتەدا کوڕێکی ((یووسف گویە))ش دێتە لایان، ناوەکەی نازانم..بەڵام دواجار زانیمان، ئەویان بۆ رۆژئاوای تورکیا تەرحیل کردبوو، هەر لەوێش مردووە..

((ملیٚ ئیبراهیم)) دەڵێت، ئێوە لێرە دانیشن مەجوولێنەوە، من دەچم خواردن پەیدا دەکەم.. دەچیتە ((پەزگەوران)) بۆ نان پەیدا کردن دەچێتە ماڵی ((کامۆریێ حەجیٚ)) و داوای خواردەمەنی دەکات.. دەپرسێت کێت لەگەڵدایە؟ دەڵیٚ کچی ئیبراهیم ئاغام لەگەڵدایە کە خێزانی شێخ حەسەن ئاغا ناوی ((ئەجیمە خاتوون))ە.. بەم جۆرە ((کاموریٚ)) و عەلی مامی خۆیان خواردنیان بۆ دەبەن، لەوێشەوە دەیبەن بۆ گوندی ((حەیدەر باوایی)) کە دەچنە ئەویٚ دەبینن لە ((ئیسماعیلییەکان)) شێخی ئاواشی لەوێدایە دایکم لەویٚ دادەنێن و دەگەڕێنەوە..

((کامۆری)) و ((عەلی بەگ)) لەو مەسەلەیەدا چاکەیەکی گەورەیان لەگەڵماندا کرد ئەو دوو زاتە، بە پیلانی ((قوپوحوسە)) کوژران.. قۆپۆ حوسە لە تەرحیل رادەکات، دێتە دەرسیم، دەچێتە ماڵی ((کامۆری)) و لەویٚ دەمێنێتەوە، جار جارەش دەچووە (ئەدەنە) بۆ کڕین و فرۆشتنی پەز و ئاژەڵ، لەو کاتانەدا یەکێك لە خێزانی ((عەلی بۆری)) شکات لە ((کامۆری)) دەکات، سەرباز بۆ پرسین و بەدواداچوون دەڕواتە ماڵی کامۆری. ئاژەڵەکانی ((قوپو)) دەبینن کە هەموو ئاژەڵی بەرزە دەبێت، بەو هۆیەوە عەلی بەگ و کامۆری دەبەن بۆ هۆزات. سەرۆکی

شارەوانی هۆزات ئەو دەمە، یەکێك لە نەوەکانی ((حەمید)) دەبێت، ناوی ((سەبری)) بوو...
یەکێك لە ئەفسەرەکان بە گاڵتەوە بە سەبری دەڵێت: ((کابرایەکی مەرد لێرەیە وەرە بیبینە))
سەبری دەڕوات، تەماشا دەکات، ئەمە ((کامۆری))یە، کامۆری سەبری ئەفەندی دەناسێت،
چونکی سەبری پێشتر لە واجیخە (ئەحصیلدار) بووە، سەبری پێی دەڵێت: ((کامۆری مەترسە
دەتانبەن بۆ ئەلازیز و لەوێ بەرەڵڵاتان دەکەن)).. کامۆری دەڵێت: من ناترسم، دەمانکوژن با
بمانکوژن.. هەر نەبێت لە ڕووی کابرایەکی ئازای وەك ((قوپۆ))وە دەمرم.. بەڵام سەربازەکان بێ
دادگایی کردن، لەوێ هەردووکیان دەکوژن..

ئەمجا دێمەوە سەر هەڵهاتنەکەی دایکم، سەربازەکان تەقەیان لێکردین و باوکم و براکەم
کوژران.. دایکم رزگاری بوو، چووە ((تەنزیە)) هەژدە ڕۆژ لەوێ دەمێنێتەوە.. خوشکە
بچووکەکەم ((ئانێ)) و برا بچووکەکەم ((یووسف)) لەگەڵ منداڵەکانی ((ئەمیل)) و
منداڵەکانی ((گویە))دا دەمێننەوە... لەولای دێی (کۆمە)وە پەڵەگەنم و جۆ هەبووە، شەو
دەچوون جۆکەیان دروێنە دەکرد دەیان کوتا و پاکیان دەکردەوە و دەیاندایە منداڵەکان، تا لە
برساندا نەمرن.. بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە... دوای هەژدە ڕۆژەکە، دایکم ئەو دوو منداڵە
لەگەڵ خۆیدا دەیانباتە دەوروبەری ((دەرێ ئارەبی)).. لەو دەمانەدا، خاڵۆم سەید خان لە دێی
((تەخەرە)) دەبێت، هەرچۆنێك بوو هەواڵی یەکترمان زانی و ئەمجارەش یەکمان گرتەوە، دوای
ئەمە چووینە دەوروبەری ((کالآن)) خاڵۆکانم زۆرجار بە باوکیان دەگوت: با پێکەوە بین لە یەك
دانەبڕێین، بەڵام بە قسەی نەدەکردن.

حوسێن یلدرم: بۆ بە قسەی خاڵۆکانتی نەکرد؟

- چونکی وادەبوو لە شوێنێکدا خەڵکێکی زۆر گرد دەبوونەوە.. گەورە و منداڵ و ژن..
هەندێك جار ۱۰۰۰-۲۰۰۰ کەس لە شوێنێکدا کۆمەڵ دەبوون، نەیاندەزانی چی بکەن..
ئەمەش باش نەبوو.. سەربازەکان دەهاتن دەیگرتن و دەیان کوشتن.. جاسوس زۆر بوون،
خەبەریان دەدا بۆیە چەند ژمارەی کۆبوونەوەکانیان کەمتر بوایە باشتر بوو..

حوسێن یلدرم: کێ بوون سیخوڕییان دەکرد و هەواڵیان لە خەڵکی دەدا؟

- بۆ نموونە لەناو ((سمکۆییەکان))دا، ((خدێ عەلی))یەك هەبوو.. لە ((قەرەباڵییەکان)) مەمەدێ عەلییێ ئوردوخلی.. لە ((ئیسماعیلییەکان))، ((بێخری))یەك هەبوو، لە ((بەختیارییەکان)) ((زەینێ مەمکی)) سیخوڕی بۆ سەربازەکان دەکرد.. زۆری دیکە.. ئەمانە دەکەوتنە پێشی سەربازەکانەوە، خەڵکیان بەدەستەوە دەدا... لێرەدا، ڕووداوێك دەگێڕمەوە:

ڕۆژێکیان، قوپۆ حوسێن لە تەرحیل رایکردبوو، چوو بووە عەلی بوغاز، بێ گومان، پێوەندی بە ((خدێ عەلی))یەوە هەبوو.. ئەو ((خدێ))یە ڕۆژێکیان دەچێتە لای، شوێن و ڕێگەی دەزانێ، تومەز نیازی خراپە.. دەچێتە لای سەربازەکانی ((خۆزات)) خەبەری لێدەدات.. لە خۆزات، یەکێك هەبوو ناوی ((شوکری)) دەبێت، لە ((نانکانییەکان))ە لەگەڵ ((خدێ))دا دەکەوتە پێش سەربازەکان، دەڕۆنە ((تەخەر)) لەوێوە دەچنە ((چڕ چریکە))، بەیانی زوو ئابلۆقەی ئەشکەوتەکەی دەدەن کچەکانی ((قۆپۆ)) بۆ ئاگرکردنەوە لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە دەبن، خەریکی چیلکە کۆکردنەوە دەبن، سەربازەکان دەبینن، هاور دەکەن ((سەرباز هات.. دەورەمانیان گرت..)).. ئەو سیخوڕانەی لەگەڵ سەربازەکاندا بوون گێڕابوویانەوە.. ((قۆپۆ)) لەپڕ دەرکەوت و ڕووبەڕووی سەربازەکان دەهات و تەقەی لێدەکردن.. ئەوجا دەگەڕێنەوە ناو ئەشکەوتەکە.. سەربازەکان ناوێرن بچنە سەری.. ماوەیەك ڕادەوەستن تەماشا دەکەن کەس تەقەیان لێناکات، دەچنە پێشەوەو سەنگەر دەگرن.. لەوکاتەدا قۆپۆ دەردەکەوێت، بەڵام لە ئەشکەوتەکە دوورکەوتبووەوە، وا بەرەو خوار دەڕوات.. شوێنی دەکەون، ژنەکەی و خۆی زامدار دەکەن.. پێیان دەگەن، دێن منداڵەکانیشی دەکوژن، دوای کوشتنیان سەریان دەبڕن و سەرەکان دەبەن بۆ ((چەمیش گێزەك)) بەر لەوەی لە ئەشکەوتەکە دەورە بدرێن، قۆپۆ ((زابتی)) کوڕی لەگەڵ ((حەسەی تاتك)) لەوێ دەردەکات.. ((تانك)) کوڕی حەیدەرێ برای ((قۆپۆ))یە.. ئەوانیش هەردووکیان دەکەونە دەستی سەربازەکان بۆ ((چەمێش گێزەك))یان دەبەن.. حوسە، لەوێدا بە قائیمقام دەڵێت ((روخسەتم بدە دەچم جەنازەکەی مامم دەنێژم..)) چەند سەربازێکی لەگەڵدا دەنێرن.. بەڵام لە ڕێگا ئەویش دەکوژن..

یەتەرە: لەناو عەشیرەتی ((قۆپوۆ))دا، کەس هەبوو چەکی بۆ دەوڵەت هەڵگرتبێت؟

- نەخێر.. کەسیان بۆ دەوڵەت چەکیان هەڵنەگرتبوو...

حوسێن یلدرم: وەکو بیستوومە، خانەوادەکەی ((سەید ڕەزا)) لە شوێنێکی نزیکی ئێوە کوشتووبوونیان.. باوکت لاشەکانی ناشتبوو، ئەمە راستە؟

- بەڵێ لە شوێنێکی نزیکی ئێمە بوو.. لە ((بردۆ)) کوشتنیان، مەسەلەکە ئاوابوو: ((سەر لە بەیانی بوو، لەپڕ سێ ئەسپ سوار پەیدا بوون، بە باوکمیان گوت: ((تۆیان دەوێت، دەبێت بۆ لای کەماڵ بەگت ببەین)) کەمال بەگ، ئەفسەرێکی تورك بوو، باوکم ڕۆیشت.. دەبینێت خێزانەکەی ((سەید ڕەزا))یان کوشتووە.. سەریانیش براوە.. شوێنی سونگیش بە جەستەیانەوەیە.. کوڕەکەی سەید ڕەزا، شێخ حەسەن، سەرەکەی لەبن پێی بینباشیەك دەبێت و دەپرسێت: ئەمە سەری کێیە؟.. باوکم دەڵێت: سەری شێخ حەسەنە، کوڕی سەید ڕەزایە.. خێزانەکەیان هەموو کوشتبوو، تەنیا دوو کچ مابوونەوە، لەوێدا بوون.. بینباشییەکە دەڵێت: ((ئەم دێهاتانە دەسووتێنم، شێخ رەزا کە لەم دەوروبەردا بووە، خواردنیان پێداوە و حەواندوویانەتەوە.. دەبینم خواردنیان پێیە، کێ بۆی هێناون؟ لەبەر ئەوە ئەم دێهاتانە دەسووتێنم..)) باوکم دەڵێت: ((بینباشی، ئەوە تۆ باسی دەکەیت، سەید ڕەزایە.. کێ خزمەتی سەید ڕەزا ناکات؟ کێ خواردنی ناداتێ؟ هەموو کەسێك دەیکات، بەڵام هەندێك کەسمان هەر ئاگاشی لێنەبووە..)).

ئیتر، بینباشی زۆر لەسەری ناڕوات.. بەڵام باوکم دەڵێت:

((بیناشی ئەم لاشانە لەبەر خۆرەکەدان.. رێگامان بدە بیاننێژین)).

بینباشی بە ((بێ تەل)) لەگەڵ قوماندانەدا قسە دەکات: ((فلان کەس لێرەیە.. وا دەڵێت، چی دەفەرموویت؟)).

قومەندانەکە رێگای دەدات دەڵێت: بیاننێژن..

باوکم ٢٠-٣٠ کەسێك پەیدا دەکات، چاڵێکی گەورە هەڵدەکەنن، خێزانەکەی ((سەید ڕەزا)) لەوێدا دەنێژن و دەگەڕێنەوە.. سەید ڕەزا، ئەو ڕۆژە خۆی ناکەوێتە دەستی سەربازەکان و رزگاری دەبێت..

حوسێن یڵدرم: کاتێك دەیانکوژن، سەید ڕەزا لەوێ دەبێت؟

- بەر لەوەی سەربازەکان بێن، ئەو هەڵدێت.. دوای ماوەیەك، دەڕوات بۆ (ئەرزنجان) لەوێ دەوڵەت دەستگیری دەکات...

یەتەرە: با بگەڕێینەوە لای ((قۆپۆ حوسێن)) کەس نەبوو بڕوات لاشەکەی بنێژێت؟

- دەوروبەری ((عەلی بوغاز)) موحەڕەمە بوو، خەڵکی ئەو دەڤەرەیان هەموو ((تەرحیل)) کردبوو.. کەس لەو ناوە نەمابووەوە، کەس نەدەچووە ئەو دەوروبەرە.. هەر کەسێك لەو ناوانە ببینرایە تەقەیان لێ دەکرد.. حوسێن یلّدرم: یانی لاشەکان لەو ناوانە مابوونەوە و گورگ و جانەوەر خواردبوویان؟.

- بێ گومان.. وابوو.. نەك ناشتنیان، لێ نێزیك بوونەوەشیان قەدەغە بوو.. ئەوانەی لە ٣٨ کوژران، زۆربەیان نەنێژران، وشك بوونەوەو ڕزین، هەر ئێسك و پرووسکیان مایەوە.. {تۆ بڵێیت رۆژێك بێت لەو شوێنانە کە کۆمەڵکوژییان لێ ئەنجام دراوە مۆنۆمێنتیان بۆ بکەن..} بوونە خۆراکی مارو مێروو.. لە هەر کۆمەڵکوژییەکدا ٣٠٠-٤٠٠ تا ٥٠٠ مرۆڤ پێکەوە دەکوژران، کێ ئەم هەموو لاشانە بنێژێت؟.. چۆن بنێژرێن؟ هەر کەسە و بیری لە مانەوەی خۆی دەکرد، کێ ناشتنی کوژراوانی لەبیر بوو؟...

حوسێن یلّدرم: ((لیل)) ئاغای مامت، لە کێوی ماران ((کۆیێ مۆری)) زامدار بوو، کوشتنەکەی ئەو چۆن بوو؟.

- با جارێك شتێکتان بۆ باس بکەم.. لە ساڵی ١٩٣٧، دەوڵەت عەبدوڵلا پاشای بۆ دەرسیم نارد، وتیان بڕۆ ((بارودۆخی دەرسیم چاك بکە..)) یەکەمجار هاتە ناو عەشیرەتی ((قۆچو))وە، هاتە لای خاڵۆکانم. یانی هاتە لای کوڕەکانی ئیدارەی ئیبراهیم ئاغا، ئەو کاتە لە ((ئاموتقا)) قوتابخانە هەبوو، ئێمە لەوێ دەمانخوێند.. باش لە یادمە عەبدوڵلا پاشا. هاتە لای مووسا و لای ڕەزا.. ئێمە قوتابی بووین چووین پێشوازیمان لێ کرد..

یەتەرە: دێکەتان لەوێ نەبوو، لە ماڵی کێ دەمایتەوە؟

- من لە ((ئاموتقە)) لە ماڵی خاڵۆم جەمشید دەمامەوە.. لە ماڵی جەمشیدی ئیدارە ئاغا قوتابخانەکەش هەر لە ماڵەکەی ((خاڵۆم لیل)) بوو.. ئەو کاتانە لە ئاموتقە قەرەقولیش هەبوو... عەبدوڵلا پاشا حەوت ڕۆژ لەوێ مایەوە، چونکی هۆزەکانی ئەو دەوروبەرە دەوڵەت

حیسابی تایبەتی بۆ دەکردن.. عەشیرەتی ((قۆچو)) بوون.. حکوومەت گرنگی پێ دەدات.. ئەوکاتانە عەشیرەتەکەی ئێمە چەکێکی زۆری تەسلیم کرد، بەڵام ئەوەندەیان مابوو دواجار بتوانن ساڵی ٣٨ شەڕی پێ بکەن... عەشیرەتەکەی ئێمەش شەڕیان کرد.. لەو دەمەدا هەندێك ڕووداو ڕوویان دا، یەکێك لەو ڕووداوانە دەگێڕمەوە: هۆزێك هەیە پێیان دەڵێن ((کالۆ)). ڕۆژێکیان ژمارەیەك سەرباز دەچنە ماڵێك شەو لەوێ دەمێننەوە، شەوێ دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنی ماڵەکە، ((کالۆییەکان)) بۆ سبەینێ دەچن لە قەرەقول چەند سەربازێك دەکوژن، لەسەر ئەو دەستدرێژییە... ڕۆژێکی دیکە، سەرباز زۆر سووکایەتی بە خەڵکی دێکە دەکەن، لە خۆڕا لە کابرایەك دەدەن و زۆر بێ حاڵی دەکەن.. خاڵۆم جەمشید دەچێتە قەرەقول و قسەیان پێ دەکات ((ئێوە لەسەرچی سووکایەتی بەم خەڵکەی ئێمە دەکەن؟)).. لەدوای ئەوە عەشیرەتی ئەو کابرایە، هێرش دەکەن و باش چاوش و هەندێك سەرباز بەدیل دەبەن... لە هۆزاتەوە سەرباز و هێزی دیکە دێنن و شەڕ لە نێوانیاندا بەرپا دەبێت... دەچن دێکەی ((قۆپۆ حوسێن)) تالآن دەکەن و کوڕەکەی دەگرن، دواجار ئەسیرەکان دەگۆڕنەوە.. کە هێرش دەکەنە هۆزات، لەوێدا لە عەشیرەتی ((سەمکوییەکان))، یووسفێ مەمۆ دەکوژن.. کوشتنی غەمێکی گەورە دەبێت بۆ عەشیرەتەکە و دەوروبەرەکەی.. چونکی کابرایەکی ئازا بوو.. هەر لەو دەمەدا لە ((قارسال)) یەکێکی دیکە دەکوژن..

حوسێن یلدرم: بەر لە ٩٣٨ز بارودۆخەکە چۆن بوو؟

- دەرسیم و دەوروبەرەکەی، هەمیشە لەگەڵ دەوڵەتدا ناکۆك بوونە.. باپیرەم ئیدارەی ئیبراهیم ئاغا نزیکەی ٣٠ ساڵ لەگەڵ دەوڵەتدا ناکۆك بووە. شەڕ و پێکدادان لە نێوانیاندا قەوماوە.. کە شەڕ ئاوا درێژە دەکێشێت ((نەشئەت پاشا)) لەگەڵ سەربازێکی زۆردا دێتە دەرسیم، لەگەڵ هۆزەکاندا دادەنیشێت.. ئیدارە ئاغا کەس ئیقناعی ناکات، سلێمان ئاغا نەبێت.. ئەو کاتە ناساغ دەبێت، بە سواری ئەسپ، سلێمان ئاغا بۆ لای نەشئەت دەبەن، نەشئەت دەڵێت: ((وادیارە ئیدارە دەیەوێت خۆی تەسلیم بکات.. ئەویش دەڵێ: ئیدارە ئاغا بە قسەی من تەسلیم نابێت، تکا دەکەم دڵنیامان بکە کە هیچی لێ ناکەیت.)) ئیدارە دەڵێت چی گوت نەشئەت بەگ؟.. پێیدەڵێ: دەرۆی بەڵام دەستگیرت دەکات... ئەمجا، موزیری کوڕی

قاسم ئۆغلۆ دەنێرێت تا ئیدارە ڕەزای بکات.. لەگەڵ ئیدارە ئاغا قسە دەکات دەڵێت: ((باشە دێم خۆم تەسلیم دەکەم..)).. دوای ئەوە دەڕواتە دێکەی ((سەید ڕەزا)) دێی ((ئاغداد))، لەوێ لە ((پیرباوو)) خۆی تەسلیم دەکات.. هەر لەو کاتەدا ((مچێی سەید جەمال))یش خۆی تەسلیم دەکات.. سەربازەکان هەردووکیان بۆ هۆزات دەبەن، لەسەر ڕێگاکەیاندا دێیەك هەیە ئێستا ناوەکەیان گۆڕیوە کردوویانە بە ((تۆرۆن ئۆبا)) لەوێ مچێ هەڵدێ، لە دواوە سەربازەکان تەقەی لێدەکەن و دەیکوژن.. لە دوای ئەمە کەلەبچە لە دەستی ئیدارە ئاغا دەنێن.. نەشئەت ئەو دەمە لە چیای ((سنجیقە)) دەبێت.. ئیدارە ئاغا بۆ لای ئەو دەبەن.. نەشئەت خۆی پێشوازی لێ دەکات، ئەنجا نەشئەت جلە دڕاوەکانی پیشانی ئیدارە ئاغا دەدات و دەڵێ: لە دووی تۆ وێڵم بزانە لەچی حاڵێکدام.. دوای وتوویژ، نەشئەت بەگ دەڵێت: ((لەگەڵ جەندرمەدا بۆ هۆزاتت دەنێرین))، ئەویش دەڵێت: ((لەگەڵ جەندرمەدا ناڕۆم، چونکی لەناو جەندرمەکاندا هەندێك کەسی ئەم دەوروبەرەیان تێدایە لە ڕێگا دەمکوژن...)).

نەشئەت ڕازی دەبێت و لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازدا دەینێرێت، بۆ هۆزات... کە دەگەنە هۆزات، ئیدارە ئاغا، تەماشا دەکات، خەڵکێکی زۆر بۆ بینینی هاتوون.. ئافرەتیش هاتبوو ئافرەتەکان خۆیان داپۆشیبوو، لەوێ بە قوموتانەکە دەڵێت: ئەو ژنانە بپشکنن هاتوون من بکوژن.. لێرە من گەلێك دوژمنم هەیە، کەس لێم نزیك نەبێتەوە..)).

ژنەکان دەپشکنن، دەمانچەیەك لەلای یەکێکیان دەدۆزنەوە، دوای دوو سێ ڕۆژ، ئیدارە ئاغا بۆ دیاربەکر دەنێرن، ئەمجارە بە تەنیا نابێت ٣٢ کەسی تری لەگەڵدا دەنێرن، هەمووشیان سەرەك هۆز و پیاوە دیارەکانی ناوچەکان دەبن.. دەیاندەنە دادگا، ئەمانیش پییان خۆش دەبێت کە بەشێوەیەکی یاسایی دادگایی بکرێن، لە بەندیخانە دەبن ((مچێ فەندی)) کە لەگەڵیاندا بووە، ئەمەی گێڕاوەتەوە: ((دیاب ئاغا، پێی وتم، بڕۆ لای پێی بڵێ حەزدەکەین چاومان پێ بکەوێت)).. چوومە قاوشەکەی پێمگوت ((دیاب ئاغا دەیەوێت بێتە لات..))، کەوای گوت ئیبراهیم ئاغا کەمێ بیری کردەوە لە دواییدا وتی ((ئەڵڵا ئەڵڵا.. دیاب ئاغا بۆ دەیەوێت ببینێت؟!)) منیش گوتم نازانم.. ئیدارەی ئیبراهیم ئاغا کەمێکی تر بیری کردەوەو دواجار وتی: ((با بفەرموێت، بابێت..)).. دیاب ئاغا چووە قاوشەکەی ئیدارە ئاغا، هەر کە لێی نزیك

دەبێتەوە یەخەی توند دەگرێت ((بیکە بە خاتری دوانزە ئیمامەکە بە قسەکانی قازی ڕازی بەو بەڵکو بەرەڵڵات دەکەن، تۆ ئازاد نەبیت ئێمە بەرەڵڵا ناکەن..)).

ئیدارە ئاغا دەڵێت: ((ئەوەی دەیلێت دەیکەم))...

لە دادگا قازی لێی دەپرسێ: ئیدارە ئاغا خۆت تەسلیم دەکەی؟ دەڵێ، بەڵێ..، قازیش هەر دەست بەجێ بڕیاری لێخۆشبوون بۆ هەموویان دەردەکات.. بەڵام دەڵێت: ئیدارە ئاغا تۆ سەدو یەك ساڵ حوکمت بەسەردا درا.. ئەویش دەڵێت: من تەمەنم چل ساڵە لەکوێ ئەوەندە ساڵە دەژیم...

لەو کاتەدا، جەمیل پاشاش زیندانی دەکرێت، ڕۆژێك ئیدارە پێی دەڵێت: ((من ڕادەکەم و خۆم ڕزگار دەکەم)).

دەڵێت: چۆن، ڕادەکەیت؟!

دەڵێت: ئا لێرەوە خۆم دەخەمە خوارێ..!!

دوای ماوەیەك، شەوێك لەگەڵ دوو کەسی تردا خۆیان دەخەنە خوارەوە، ئیدارە، بە سووکی زامدار دەبێت، یەکێکیان پشتی دەشکێت ئەوی دیکەشیان دەمرێت.. ئیدارە خۆی ڕزگار دەکات، ماوەیەك لەو دەوروبەرە خۆی دەشارێتەوە، دواجار دەچێتە ماڵی خۆیان، کە ئەو دەگەڕێتەوە قائیمقامی ((چەمیش گێزەك)) و بەڕێوەبەری شارەدێ لەوێ نامێنن و خۆیان دەگوازنەوە... دوای ماوەیەك، مستەفا کەمال، ((سەید ڕەزا)) و ((ئیدارە ئاغا)) دەکاتە نوێنەری ئەنجوومەن، بەم بۆنەیەوە نوێنەرێك دەنێرن پێی دەڵێت: ((مستەفا کەمال تۆ و سەید ڕەزای بە نوێنەر داناوە دەیەوێت چاوی پێتان بکەوێت...)).. ئیدارە ئاغا، پێدەکەنێت و دەڵێت: ((من لە کانی عوسمانییەکاندا ئاو ناخۆمەوە وا تەمەنیشم بەسەرچووە.. سەیدا ڕەزا ئارەزووی خۆیەتی، بەڵام من ناڕۆم..)).

((سەید ڕەزا))ش هەمان هەڵوێستی دەبێت و ناڕوات.. دواجار مستەفا کەمال ((مچێ زەینێ-مچۆ ئاغا-)) و ((دیاب ئاغا)) بانگ دەکات و قسەیان لەگەڵدا دەکات.. ئەو ڕۆیشتنەیان بۆ ئەنقەرە، بووە پەڵەیەك و بە نێو چاوانیانەوە مایەوە...

ئەو دەمە، هێشتا ڕێککەوتنی ((لۆزان)) مۆر نەکرابوو، هەموو ڕۆژێك لە دەرسیمەوە تەلەگراف بۆ وەزارەتەکانی دەرەوەی ولاَتان دەنێررا.. ((ئێمە میللەتێکین جیاواز، دەوڵەتی خۆمان دەوێت)). کە دیاب ئاغا و مچۆ ئاغا، دەڕۆنە لای مستەفا کەمال، پێیان دەڵێت: ((دەبێت تەلەگراف بۆ ولاَتان بنێرن: ئەوانەی داوای دەوڵەت دەکەن ((ئەشقیان))، ئێمە نوێنەری میللەتین هیچ داوایەکی وامان نییە.

حوسێن یلدرم: ئەی حەسەن خەیری کێیە؟

- حەسەن خەیری، لەناو ((قەرەبالییەکاندا)) لە عەشیرەتی ((گەنگی))ن کوڕی ئیسماعیل ئاغایە، براکەی ناوی ((ڕەمزی)) بوو، لە دەرسیمەوە دەڕوات بۆ ((سارز))ی قەیسەری و لەوێ نیشتەجێ بووە.. حەسەن خەیری لە پێشدا لەگەڵ ((مستەفا کەمال))دا بەینی باش دەبێت، کردبوویە نوێنەری میللەت و لە سەربازیش پلەی ((یاربای))یان پێ دابوو.. بەڵام دواجار هەندێك هەڵسوکەوت دەکات، مستەفا کەمال لەخۆی دووری دەخاتەوە.. هەروەها نامەیەکی کە بۆ ((شێخ سەعید)) ناردبوو، ئەو نامەیە دەکەوێتە دەستی دەوڵەت.. لە نامەکەیدا نووسیبووی: ((من دەتوانم دەرسیمییەکان ئیقناع بکەم تاکو لەگەڵتابن...)).. ئاوای نووسیبوو.. ئەم نامەیە کەوتبووە دەستی دەوڵەت، هەر ئەو ڕۆژەی شێخ سەعید ئیعدام دەکەن، ئەویش لە ((ئەلازیز)) ئیعدام دەکەن..

حوسێن یلدرم: ساڵی ١٩٢٦، ڕووداوێك قەوماوە، ئەوە چۆن بوو؟

- بەڵێ ١٩٢٦ز سەرباز دێ بۆ دێکە.. باپیرەم ساڵی ١٩٢٥ کۆچی دوایی دەکات، دوای مردنی سەرباز دێت و عەشیرەتی قۆچۆ ئابلۆقە دەدەن..

حوسێن یلدرم: لە ناوچەکە ئێمە، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((موزیر عەسکەری)) لەوێ شتێ قەوماوە.. ئەوەمان بۆ باس بکە..؟ کەی بووە؟.

- لە ١٩٢٦ز، سەرباز هێرشی کردووەتە سەر ((قۆچو))ەکان.. ئەو دەمە خەڵکێکی زۆری دەوروبەری دەرسیم بە میلیشیا بوو بوون و یارمەتی دەوڵەتیان دەدا.. وەکو دەگێڕنەوە، دیاب ئاغا، بە مستەفا کەمال دەڵێت: ((ئەگەر سەربازم بۆ بنێرێت من بە ١٥ ڕۆژ ((قۆچو))ەکان تەسلیم دەکەم..))... بۆیە سەرباز لە ((عەلی بوغاز))ەوە بە فەرماندەیی ((مستەفا

مەغلالی)) هێرش دێنێت، ئەوانەی ئێمە دێکانیان چۆڵ دەکەن و لە عەلی بوغاز نامێنن. لە ((تەپە گورگ)) شەڕ دەستی پێ دەکات، سەربازەکان ٤٠ ڕۆژ لەوێ شەڕ دەکەن، بەڵام ناتوانن ((تەپە گورگ)) بگرن.. ئەو شەڕە سێ مانگ بەردەوام بوو کە بە مەبەستی خۆیان نەگەیشتن کشانەوە، بەڵام چەند دێیەك دەسووتێنن و تالان دەکەن.. خەڵکی زۆریش کوژران.. بەڵام ((قۆچووەکان)) خۆیان بەدەستەوە نەدا، ژمارەیەکی زۆریش لە سوپا کوژرا.. لەو شەڕەدا ((موزیر)) دەکوژرێت، ئیتر ئەوێ بەو ناوەوە ناونرا ((عەسکەری موزیر)).

یەتەرە: ساڵی ٣٨، کە سەربازەکان هاتن چیتان کرد، چۆن دێکانتان چۆڵ کرد؟.

- لە پشت ((قۆجە))وە جێگەیەك هەیە پێی دەڵێن ((قەواجیکە)) بۆ ئەوێ چووبوون، لەوەڕگایە.. تەماشامان کرد ((خالۆم سەید خان)) و ((قوپۆ حوسێن)) وا بۆ لای ئێمە دێن، مامەم لیل بە باوکی گوت ((شێخ حەسەن نزیك بووەوە لە چادرەکان ئاگادارم بکەرەوە، تا پێشوازییان لێ بکەم، ((لیل))ی مامم چاوی نەیدەبینی.. کە نزیك بوونەوە، باوکم ئاگاداری کردەوە.. ((لیل))ی مامم، کۆچانەکەی بەدەستەوە گرت و لە چادرەکە چووە دەرەوە. کە دەرچوو ئەمان گەیشتن و لە ئەسپەکانیان دابەزین..

یڵدرم: لیل توانای ڕێکردنی هەبوو؟

- بێ گومان.. ئەو دەمە لە تەمەنی ٨٠-٩٠ ساڵیدا بوو.. زۆریان ڕێز لێدەگرت، بۆیە هەرکە بینییان هاتنە پیرییەوە... دانیشتن و دەستکرا بە قسە و باس.. ((لیل))ی مامم وتی: ((هێزە چاوتان لەم خەڵکە بێت.. ئەمە شەپۆلێکە و هاتووە و دەڕوا.. دنیا هەروا بووە.. دێت و دەڕوات.. دێت و دەڕوات..))

قۆپو گوتی: ((لیل ئاغا، خۆزی خودا ٢٤ سەعات تۆی بۆ وەختی جارانتی دەگەڕاندەوە.. ئێمە هیچمان نەگەرەك بوو..)).. ((لیل))ی مامم وتی: نەخێر.. نەخێر، ئێوە ئێستا لەمن باشترن..)) ئەو ڕۆژە قسەو باس زۆرکرا، بڕیاری خۆیان دا، دواجار سەید خان و قوپۆ حوسێن وتیان: ((ئێمە ئێوارە دەگەڕێینەوەو بۆ عەلی بوغاز دەچین. شەو دەچینە ((کێوی ماران))، لەوێە دەچینە ((کالۆ))... ئێوارە هەستاین چووینە کێوی ماران، بەڵام سەربازەکان ڕێگەکەیان گرتبوو، تەقەیان لێ کردین.. ((لیل)) بە تەمەن بوو، سواری ئەسپێك بوو بوو، خەلیل، سەری

ئەسپەکەی رادەکێشا... گەڕاینەوە دواوە، تومەز، خەلیل، لیلی مامم بەجیَ دێلێت و سەری ئەسپەکەی بەردەدات... لەوێدا لیل زامدار دەبێت.. دواجار دێن دەیکوژن.. بەڵام دواجار لاشەکەیان هێنایەوە و ناشتمان.. ڕێگەمان گۆڕی چووینە ((عەلی بوغاز))، لەویَ بووینە دوو بەشەوە، چونکی ژمارەمان زۆر بوو.. ئێمە و سەید خان و جەماعەتەکەی ((یانی ئیدارە ئیبراهیم ئاغا)) پێکەوە بووین.. نزیکەی ٤٠٠ کەس دەبووین، ڕێگای ((تەنزگە))مان گرت.. ئەوانی دیکە بە دامێن چیای ((مونزور))ەوە، بەرەو ((کالۆ)) ڕۆیشتن، کە قوپۆ حوسێن و رەسکۆ و برێکی تر بوون.. بەو شێوەیە هاتینە ((تەخەر)) زۆر نەڕۆیشتین، لە سەرەوە تەقەیان لیَ کردین، تومەز سەرباز ئەوێشی گرتووە. ژن و منداڵەکانمان دوورخستەوە، بەرەو دۆڵی ئاغا ڕۆیشتین، ئەوەی لێمان جیابووەوە گەڕابوونە دواوە و چوونە عەلی بوغاز لەویَ ئەشکەوتی ((ئاشیە)) هەیە، لەویَ خۆیان شاردبووەوە.

حوسێن یلدرم: ئەو کاتە هێشتا باوکت نەکوژرا بوو؟.

- نەخێر..

- ئەی دواتر؟

- تا بەیانی لەویَ دەمێننەوە، ئەوەی چەکی پیَ بوو، شەو لە دەوروبەری ئەشکەوتەکە ئێشکی دەگرت.. لەپڕ دیسانەوە سەرباز لەو ناوانەدا پەیدا بوون دنیا گەرم بوو.. قوموتانەکەیان لە پێشەوە دەبێت، لەبەر گەرما پارچەیەکی بەسەردا دابوو، ((باوکم)) و پیاوەکان دەڵێن: نەکەن تەقەیان لیَ بکەن.. ئەو قسەکەی تەواو ناکات لەپڕ ((وەلی)) ناوێك تەقە لە قوموتانەکە دەکات لە ئەسپەکەی بەردەبێتەوە.. سەربازەکان نازانن لە کوێوە تەقەیان لێکراوە.. بەو ناوەدا دەگەڕێن، بەڵام بەلای ئەشکەوتەکەدا ناچن، سەربازەکان لاشەکە هەڵدەگرن و دەگەڕێنەوە. بۆ بەیانی سەربازەکان دیسان دەگەڕێنەوە، کوڕێکی ((تەمری))یان لەگەڵدا دەبێت، دەیهێنن لە ((چرچریکە)) بە سونگی دەیکوژن..

حوسێن یلدرم: ئەوە کوڕی ((تەمریَ)) ئاغای قەرەباڵیان نەبوو؟

- بەڵیَ.. کوڕی ئەو تەمریَ دەبێت...

هێرشی دووەمی سەربازی.. ئەم قومو‌تانە ئەوکاتە لە هۆزات دەبن ((کازم ئوربانی))، ((سالّح ئومورتاق)).. لەم هێرشەدا خەڵکێکی زۆر دەکوژن.. دەڵێن لەو قەتلوعامەدا ٣٨ هەزار کەس قەتلوعام کران.. ئەم ژمارەیە بەپێی ئاماری دەوڵەت.. بەڵام لە ڕاستیدا گەلێك لەو ژمارەیە زۆرتر کوژراون... لە هۆزات، پلیموریا، پیرتەکا، واچوغە، ماماکیێ، قزل کلیسە، خەڵکێکی زۆر کوژران.. پێشتریش وتم، ئەو هۆزانەی یارمەتی دەوڵەتیان دەدا، زیانێکی زۆر گەورەیان گەیاندە میللەتەکە.. بەڵام دواجار کە ئیشیان پێیان نەما، ئەوانیشیان کوشت.

حوسێن یلّدرم: خێزانەکەی کازم ئاغا وا لێرەیە، کچی سەید خانی ئاغایە، دەبا ((دەلیێ)) خاتوون بۆمان بدوێت:

((ساڵی ٣٨، باوکم بۆ ئاقرەگەی ناردین.. ئێمە سێ منداڵ بووین.. کە دێی دیاب ئاغا بوو.. لەوێ ماینەوە..

یلّدرم: بۆ ئێوەی بۆ ئەوێ نارد ؟.

– ئێمە منداڵ بووین، بەرگەی ئەو دەشت و چۆڵە و چیایانەمان نەدەگرت کێ ئێمەی لەو دەشت و چیایانەدا بە کۆڵەوە دەگرت و ئاگادارمان دەبوو.. چووینە ماڵی بووکەکەی دیاب ئاغا. دێکە سەربازی لێبوو، ئەگەر بیانزانیبا بۆ ئەوانیش باش نەدەبوو.. بۆیە ماوەیەکی کورت لەوێ ماینەوە، ئێمەیان بردە ئەشکەوتێك، بێ گومان تەنیا نەبووین، هەندێك لە خزمانمان لەگەڵدا بوون... ڕۆژێکیان ((قوچۆ)) و ((سەی دالیا)) هاتنە ئەشکەوتەکە، تومەز سەربازەکان بینیویانن، بۆ سبەینێ یەکێك لە خۆمان ئاگاداری کردینەوە.. ((هەڵسن، سەربازەکان دەورەیان داوین..))

چەند ئەسپ سوارێك هاتبوونە دەوروبەری ئەشکەوتەکە. چەند چەکدارێکی میلیشیایان نارد ئێمەیان لە ئەشکەوتەکە دەرهێنا.. لەولاترەوە ئەسپ سوارێك ڕاوەستابوو، ئێمەیان بردە لای، چەند پرسیارێکی لێ کردین، بەڵام ئێمە تورکیمان نەدەزانی. کوڕەکەی ((حەسە بەسە)) لە قوتابخانە تورکی فێرببوو.. کابرا پرسیبووی: ((کێ ئێوەی هێنایە ئێرە؟)) وتمان ((خۆمان هاتووین..)) دووبارە پرسی: ((کێ خواردنتان بۆ دێنێ؟)) دیسانەوە خۆمان خواردنمان پێیە.. دوای ماوەیەك ژنەکانیشیان هێنا، لەناو ئافرەتەکاندا ((خەجە)) کەمێك تورکی دەزانی، لەویان

پرسی: ((کێ ئێوەی هێنایە ئەم ئەشکەوتە؟)).. وتی ((موختار)).. باشە کێ خواردنتان دەداتێ؟ دیسان وتی ((موختار)).. لە ناوماندا، تازە بووکێك هەبوو، قوموتان چووە نزیکییەو، بەهۆی وەرگێڕەکەوە هەندێك پرسیاری لێ کرد.. بە پرسیارەکانیدا دیاربوو، نیازی خراپە.. بۆ ئەوەی دەستدرێژی نەکات بووکەکە وتی: کچم شووم نەکردووە... بووکەکەی دوور خستەوە، کە گەڕایەوە زۆر پەرێشان و شڵەژا بوو.. هەر کە گەیشتە لای ئێمە.. دەستی بە گریان کرد وتی ((لاقەی کردم، پیسی کردم..)) ئەو ژنە تا مرد نەهاتە سەرخۆی.. کە تەرحیل کرا، زۆری نەبرد لە خەفەتان مرد... موختارەکە لە نەوەی ((دیاب ئاغا)) بوو، کوڕی ((وەلی ئاغا)) بوو.. ئێمەیان بردە ناو چەند چادرێکەوە. زۆری پێنەچوو، هەموو دانیشتووانی ((ئاقرەگە))یان هێنا.. دێکەشیان سووتاند بوو...

یلّدرم: ئەو کاتە، دیاب ئاغا لەوێ نەبوو؟

- نەخێر.. لەو کاتەدا نەمابوو.. ((مچەزەینێ)) لە ژیاندا بوو. ئەویش ساڵی ٣٨ دەوڵەت کوشتی.. ئەمجا موختار و چەند کەسێکی دیکەیان هێنا کەمی لەولای ئێمەوە بەر گوللەیان دان و کوشتیانن.. دووبارە هێنامانیانەوە شوێنەکەی خۆمان..

یلّدرم: ئێوە لاشەکانتان بینی؟

- بێ گومان..

سەربازی کورد لەناو سەربازەکاندا هەبوو، بە ((خەجە))یان گوتبوو، ئێوەیان بۆ کوشتن هێنابوو.. بەڵام تەلەفۆن کراوە ((لێبوردن هەیە..)).

بەو جۆرە لە مردنی مسۆگەر ڕزگارمان بوو.. بەڵام زانیمان ((تەرحیل))مان دەکەن، هەروا دەرچوو، ئێمەیان بۆ ((ئایدن)) ڕەوانەکرد..

حوسێن یلّدرم: ئێوە سێ خوشك پێکەوە بوون؟

- بەڵێ.. من، هەدێ، خاتوون... لە ئایدن ئێمەیان ناردە دێکەی ((خدر بەگ)) باوکم ((سەید خان ئاغا)) کە تەرحیلی دەکەن، ئاگای لە ئێمە نامێنێت و نەشیدەزانی ئێمە لە کوێین.. دواجار زانی ئێمە وا لە ((ئایدن)) داین، بەڵام نەیدەزانی لە کوێی ئایدنداین.. داوای مۆڵەت دەکات، تا سۆراخی ئێمە بکات ئەوجا مۆڵەتی دەدەنێ.. یەکێکیش بۆ سۆراخ کردن

بۆ ((ئایدن)) دەنێرێت.. بەو کابرایە دەڵێت: برۆ ئایدن، بپرسە بزانە ئەوانەی دەرسیم بۆ کوێ (تەرحیل) کراون، کچەکانی سەید خان ئاغا لە کوێن؟، ئاوا بپرسیت، دەیاندۆزیتەوە، چونکی هەموو کەسێك ئێمە دەناسێت. ئەو پیاوە، دێتە (٠ئایدن)) بە ڕێکەوت تووشی دەبێتە تووشی شوانەکەی ماڵی پوورم، دەڵێت: من ڕوخسەتم لە دەوڵەت وەرگرتووە، دەزانم کچەکانی سەید خان ئاغا لێرەن.. بەڵام ڕێ و شوێنیان نازانم، ئەگەر دەزانی پێم بڵێ..)) شوانەکە ناوی ((چەتێ)) دەبێت، دەڵێت ((من دەزانم لە کوێن)).. دەکەوێتە پێشی و دەیهێنێت بۆ لامان... پیاوەکە دەڵێت: ((من بە ئاگاداری دەوڵەت هاتووم.. هاتووم بیانبەمەوە.. ناوی مامەکانم دەڵێت، وەسفی باوکم دەکات، بەڵام ((خەجە)) دەڵێت: ((من منداڵ بە دەستی تۆوە نادەم.. ناتناسم و بڕوات پێ ناکەم...)).

یڵدرم: تا ئەوکاتە، ئاگاتان لە باوك و دایکتان نەبوو؟

- نەخێر ئاگامان لە یەك نەبوو...

کابرا زۆر هەوڵ دەدات، تا ((خەجە)) ڕازی دەکات.. کابرا ئێمەی گەیاندە لای باوکم..

کازم: دەمەوێت هەندێ باسیت ((پوزیوانگ)) بکەن، چونکی بووە مایەی ناخۆشی دوو عەشیرەت.. هەرایەکی گەورەی لێ قەوما..

((پوزیوانگ)) سەر بە قۆچانییەکان بوو.. خاوەنی ئاواییەکە، ((قوچۆ بەرتال)) ویستوویەتی دێکە بفرۆشێت، لەبەر ئەو ((ئاواسییەکان)) و ((خرخولەکان)) دەکەونە گیانی یەکتر، خرخولەکان دەڵێن ئێمە دەیکڕین. ((ئاواسییەکان)) یانی ئەوانەی سەر بە سەید ڕەزا بوون، دەڵێن: نەخێر ئێمە دەیکڕین... مەسەلەکە دەتەنێتەوە، شەڕ لە نێوانیاندا بەرپا دەبێت.. زۆر کەس لە هەردوولا دەکوژرێن.. لە دواییدا، ((باوا))ی کوڕی سەید ڕەزا دەکوژرێت.. کوشتنەکەی دەستی ((ڕایوەر قۆپ))ی تێدا دەبێت، چونکی ((ڕایوەر قۆپ)) و ((باوا)) نێوانیان باش نابێت، ((ڕایوەر)) دەیەوێت باوا بکوژێت، ئەمە چۆن ئەنجام بدات؟ دەڕواتە لای ((خرخولییەکان)) و لەگەڵیاندا ڕێك دەکەوێت، بە مەرجێك کوڕی مامەکەی بۆ بکوژن.. ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی پاییز، لە ڕۆژی ڕۆژوگرتنی خزردا ((باوا)) بۆ هۆزات دەڕوات، لە گەڕانەوەیدا بە ڕێگای ((سینە))دا دێتەوە.. لەوکاتەدا سەید ڕەزا، لەگەڵ قرخولییەکاندا ئاشت

دەبێتەوە، باوا لە ((سینە)) لادەدات و دەبێتە میوانی ماڵێك، بەیانی دوو هاوڕێی لەوێدا دەکوژن.. (سەید ڕەزا))ش، لە تۆڵەی (باوا)دا، دێی ((سینە)) دەسووتێنێت و قرخولییەکان لە دێکەی خۆیان دەردەکات.. دواجار کە ۳۸ هات، لەو ساڵەدا (دەوڵەت ئەوەی بە سەید ڕەزا کرد پێشتر باسمان کرد) خزمەکانی ((سەید رەزا))، بە تایبەتی پوورزاکەی، ((ڕەیڤەری سەید ئاغا قۆپ))، چووە پاڵ دەوڵەت بەرانبەر سەید ڕەزا کەوتە شەڕکردن،لەو مەسەلەیەدایارمەتییەکی گەورەی دەوڵەتی دا..

* * *

قۆپ، ساڵی ۳۸ رۆژێکیان دەچێتە ((دەشت)) بۆ لای پاشا، عەلی کوڕی لەگەڵیدا دەبێت، کە دەچنە چادرەکەوە، قۆپی بە نێزە دەکوژن، کوڕەکەی لە دوایەوە دەبێ ڕادەکات، خۆی دەگەیەنێتە لای ئەسپەکانیان، بەڵام لە دواوە تەقەی لێدەکەن ئەویش دەکوژن. هەر ئەو کوڕەو سێ کچی دەبێت، کچەکانی یەکێکیان خێزانی منە، ئەوی تریان ((پولات)) خواستی.. حەسەن ناوێکیش ئەو کچەکەی دیکەی خواست..

تاخمی سەید ڕەزا، بەدەستی ((ڕایوەر)) لە ناوچوون.. ((ڕایوەر)) هەندێك کاری دەکرد، دواجار هەر خۆی دەچوو خەبەری دەدا دەیگوت ((سەید ڕەزا)) کردوویەتی.. منداڵەکانی ((قۆپ))یش تەرحیل کران هەروەها هەندێك لە نەوەکانی سەید رەزاش لە کوشتن ڕزگاریان بوو (تەرحیل) کران.. پولات، ساڵی ۱۹۸٦ کوشتیان..

یڵدرم: لەبەرچی؟

– وتیان پۆلات بووە بە ((MIT)).. بەڵام پۆلات و میت پێوەندیان بەیەکەوە نەبوو.. من وام بیستووە گوایە خەبەریان لێداوە پۆڵات وێنەی سەید ڕەزای لە ماڵەوە هەڵواسیوە...

یڵدرم: ((دڵی خاتوون)) کە لە تەرحیل گەڕانەوە بۆ کوێ چوون؟

دڵی: چووینە ((کوژم)) لەوێ لەگەڵ ((لیل))ی ماممدا یەکمان گرتەوە.

یڵدرم: ((لیل))ی مامت کەی مرد؟

- دوای گەڕانەوەمان لە تەرحیل کردنمان، لەوێ ساڵێك ماینەوە، ماڵی باوکم هاتبوونە ((قەیسەری)) لە گەڕانەوەیدا لای رووباری ((موراد)) شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((خدر دامی)) لەوێ مرد.

یلدرم: کازم، ئێ،ە چۆن لە تەرحیل گەڕانەوە؟

- من و خاڵۆم جەمشید ئاغا پێکەوە بووین، لێبوردن دەرچوو من لە قەیسەری بووم، لەوێوە من چووم بۆ ئەنقەرە، لە هۆزاتەوە ((سمکۆکان)) هاتن ئێمەیان گەڕاندەوە شوێنی خۆمان کە گەڕاینەوە ئاموتقە، هێشتا دەوروبەرەکەی (موحەڕەمە) بوو.. سەید خان و منیش چووین، لەوێ وێنەی لەگەڵ گرتین. بەڵێنی دا شوێنە قەدەغە کراوەکان بکرێنەوە و هەر کەسێ بڕواتە شوێنی خۆی.

ئێمەش پێشتر لەگەڵ ((قەرەباڵییەکاندا)) بەینمان باش بوو، ڕۆژێکیان ئامۆژنم خێزانی ((لیل)) دەڕواتە باوان، باوکی ناوی ((مچێ زەینێ)) بوو، نوێنەری میللەت بووە. چەند کەسێکی ئێمە لەو کاتانەدا دەڕۆن هێسترەکانی قۆح ئاغا دەدزن و دەیهێنن، ئەوانیش بۆ شەوی دواتر دێن و هێسترەکانی خۆیان لەسەر ئاخوڕ دەبەنەوە.. لەو کاتەشدا خێزانەکەی ((لیل)) دەگەڕێتەوە، دەگاتە دێی ((تەنەر)) حەسەن ناوێك لە دێکەدا دەڕوات ڕەشمەی هێسترەکەی دەگرێت و دەڵێت ئەم هێسترە دەبەم بۆخۆم.. ژنە دەڵێت: من خێزانی ((لیل سلێمان ئاغام)) لە هێسترەکەم دامەبەزێنە، ئەگەر هێسترەکە ببەیت ئیش گەورە دەبێتەوە..)).. ئەوەی لەگەڵ ژنەکەدا دەبێت، بە کابرا دەڵێت: ((تۆ شێت بوویت، دەتوانی هێستری لیل ئاغا ببەیت؟))... لە دواییدا نایباو وازدێنێت.. ژنەکە کە دەگەڕێتەوە، مەسەلەکە دەگێڕێتەوە.. دەرێ عەلی و یووسف و حەیدەر بە مەسەلەکە دەزانن.. دەڕۆن ئابلۆقەی ((تەنەر)) دەدەن، تەنەر، هی قۆح ئاغا بوو، ئەوانەی لەوێن لە بەختیارییەکانن. دێکە بەر گوللە دەدەن.. ((تەنەرییەکان)) دەکەونە دوویان، سلێمان زامدار دەکەن، بەو زامدارییەوە دەمرێت. لەوەوە نێوانمان لەگەڵ بەختیارییەکاندا باش نەبوو... دوای مردنی سلێمان عەشیرەتەکەمان کۆدەبنەوە و هێرش دەکەنە سەر ((تەنەر))، لەو شەڕ و پێکدادانەدا کوڕێکی قۆچ دەکوژرێت، لە ئێمەش حەیدەر دەکوژرێت...

*　*　*

حوسێن یڵدرم: کازم ئاغا، ئەگەر هۆزەکانی دەرسیم نێوانیان باش بووایە، حکوومەت ئەو قەتل و عامەی لە دەرسیم نەدەکرد.. تۆ چی دەڵێیت؟

- ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، لەو سەد ساڵەی دواییەدا ئەوەندە پاشا هات و ڕۆیی نەیانتوانی دەرسیم بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، بەڵام لەو دواییانەدا چوونە ژێر کلێشەی هەندێك هۆز و عەشیرەتەوە و هەڵیانخەڵەتاندن.. ئەگەر وا نەبووایە حاڵی دەرسیم وەها نەدەبوو.. ((قەرەمالی))یەکان لە هەموو کەسێك زیاتر خەڵەتێنران، ئەمجا ((فەرات))یەکان، دواجار ((پەزگەوری))یەکان ئەگەر چەکیان بۆ حکوومەت هەڵنەگرتایە نەکەوتنایەتە پێشی جەندرمە، ڕێگایان بە لەشکر پیشان نەدایە وا نەدەبوو... چیا بە چیا، ئەشکەوت بە ئەشکەوتیان شارەزا کردن...

حوسێن یڵدرم: کازم ئاغا.. خوات لێ ڕازی بێت، ماندوومان کردیت ئێمەش ئەوەی تۆ گوتت تۆمارمان کرد..

- من سوپاسی ئێوە دەکەم.. بەڵام لەم ساڵانەی دواییەدا دەوڵەت سەرلەنوێ دێکانمانیان سووتاند و ڕووخاند.. هەر یەکێکمان کەوتووینەتە قوڕنەی شارێك.. پارچە پارچە بووینە.. هەندێکمان لە ئەڵمانیایە، هەندێکمان لە ئەنقەرەدایە.. لە ئەستەنبوڵە... ماوەیەکی تر کەسمان یەکتر ناناسین، کێ کوڕی کێ بووە، کی خەڵکی کوێیە.. تۆمار کردنی ئەم ڕووداوانە لە جێگای خۆیدایە تا سبەی منداڵەکانمان، نەوەکانمان کە گوێیان لێ دەبێت دەڵێن ((ئێمە خەڵکی فلانە جێگاین. باو باپیرمان فلان و فلانە)).

**من دایکی ئێوەم ئێوەش کوڕی منن**

ی. ئەر: ناوی خۆتمان پێ بڵێ و خەڵکی کوێیت؟

مەنسە: ناوم ((مەنسە))یە، مەنسەی خەڵە بورژی.

ی. ئەر: وەکو زانیومانە، لە ساڵی ٣٨، قەتلوعامەکە ئێوەشی گرتەوە، ڕۆژی سەختتان بینی، باسی ئەو ڕۆژانەمان بۆ ناکەیت؟.

– ئەوەندەمان بینی، ئەوەندە ڕۆژی ڕەشمان بینی، نازانم کامەی باس بکەم و لە کوێوە دەستی پێ بکەم.

ی. ئەر: چۆنت دەوێت ئاوای باس بکە و لە کوێوە دەتەوێت لەوێوە دەستی پێ بکە..

– لە پێشدا کوڕەکەی سەید ڕەزا ((باوا)) چۆن کوژرا باسی ئەوە دەکەم.. ڕۆژێکیان شوانەکەی ((باوا)) لەگەڵ چەند کەسێکدا بۆ خۆزات دەڕۆن، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن ((باڵی خوخلی)) لەوێ دەبنە میوانی ماڵێك.. بەیانی شوانە، بۆ خەربات دەڕوات، شوانەکە ناوی ((حەسەن کاژێ)) دەبێت... دەڕوات بۆ خەربات دەڵێت دەڕۆم ((بۆ کڕین و فرۆشتن)) لەوکاتەدا ((باوا)) دەڵێت: حەسە خەونم بینیوە، دەترسم شتێك ڕووبدات و بە سەلامەتی نەگەڕێمەوە..)) خەونەکەی بۆ حەسۆ دەگێڕێتەوە ((.. لەسەر پردێك دەپەڕیمەوە کەوتمە ناو ئاوەکەوە و نەمتوانی دەرچم..)).

کوڕی ((خدێ مورتێ)) و کوڕی ((فەرێ ئاغا))ش لەگەڵ باوادا دەبن.. کە لە خۆزات دەگەڕێنەوە دەچنە دێی ((سین))، کە سەر بە عەشیرەتی ((قرخان))ە.. قرخانییەکانیش لە کۆنەوە لەگەڵ سەید ڕەزادا نێوانیان باش نابێت.. بەڵام ئەو دەمە ئاشتیش بوو بوونەوە..

ئێوارێ خاوەن ماڵەکە لەگەڵ چەند کەسێکدا ڕێکدەکەون ((باوا)) بکوژن کە ((باوا)) دەکەوێتە ڕێ لەبەر دەرگا بەر گوللەی دەدەن و لەوێدا دەکەوێت.. هاوڕێکانی هەڵدێن، بەڵام لە دواوە تەقەیان لێدەکەن کوڕەکەی ((خدێ)) زامدار دەبێت فەرێ ئاغاش بەری دەکەوێت، بەڵام توانی رابکات و هەڵبێت، بەڵام دوایان دەکەون، پێیدادەگەن و ئەویش دەکوژن..

دواجار تاخمی سەید ڕەزا هێرش دەکەنە سەر دێکەیان و پێیان چۆڵ دەکەن.. ئەوەی ڕاستی بێت کوڕەکەی سەید رەزا، کابرایەکی ناوداری دەڤەری دەرسیم بوو...

ی. ئەر: لە ساڵی ٣٨ چی ڕووی دا تۆ باسی ئەوەمان بۆ بکە؟.

– بەر لە ساڵی ٣٨، سەید ڕەزایان هەڵواسی، تەنیا هەر ئەویان ئیعدام نەکرد ((ڕەسیك))ی کوڕی و چەند کەسێکی دیکەشیان پێکەوە هەڵواسی. خەڵکەکە بەم ڕووداوە زۆر غەمبار بوون.. دەڵێن لەکاتی هەڵواسینیاندا وتبووی: ((من بەر لە کوڕەکەم هەڵواسن))، بەڵام جەندرمەکان بۆ زیاتر ئازاردانی کوڕەکەیان بەر لە خۆی هەڵواسی.. کە نۆبەی ئەو هاتبوو،

جەندرمەکان ویستبوویان دەستی بگرن و بیبەن، بەڵام ئەو ڕازی نابێت، خۆی پەتەکەی لە ملی خۆی نابوو... و شەقێکی لە کورسییەکەی ژێر پای هەڵدابوو.. دەڵێن سێ جار پەتەکە پچڕاوەو هەر خۆی لە ملی خۆی ناوەتەوە، تا دواجار شەهید بووە...

ی. ئەر: با بۆ ساڵی ٣٨ بگەڕێینەوە..

- بەڵێ.. ساڵی ٣٨، لە ڕۆژێکی هاویندا بوو لەپڕ سەربازێکی زۆر پەیدا بوون، هاتن و خەڵکەکەیان کۆکردەوە.. وتیان ((چەکەکانتان بێنن تەسلیمی بکەن..))، ئەوی هەیبوو، بردی تەسلیمی کرد... ئەوی نەیبوو، کۆیان کردنەوەو پێیان ڕاسپارد: تا چەك نەهێنن بەرتان نادەین...، یەکێك لەوانە ئێمە بووین، باوکمیان گرت و وتیان چەکەکانتان تەسلیم نەکەن بەر نادرێن.. لە دێکەدا تەنیا باوکم تورکی دەزانی.

ی. ئە: دواجار؟

- دواجار، برا گەورەکەم و خوشکەکەم چوونە ((سلێمان مەرخۆ)) لەوێ چەکێکیان هێنا، کڕیبوویان، ئەوجا باوکم بەربوو... باش چاوشێکی عەرەب، ناسیاریمان لەگەڵدا هەبوو، پێمانی ڕاگەیاند ((وریا بن نیازیان وایە بتانکوژن..))، بەڵام خەڵکی دێکە بڕوا بە قسەکەی ناکەن دەڵێن: ((ئەم هەموو خەڵکە چۆن دەکوژن!!)) سەربازەکان خەڵکەکە کۆدەکەنەوە، پرسیاریان لێدەکەن: ((کێ ئاغایە.. کێ هەژار و مسکینە..؟)) باوکم تکایان لێدەکات: ((وازمان لێبێنن ئێمە کەسمان ئاغا نییە و ئاغاشمان تێدا نییە..)). یەکێك لە قوموتانەکان، کاغەزێکی بەدەستەوە بووە و دەپرسێت ((کێ لە بۆروجییەکانە؟)) بۆروجو، عەشیرەتی ئێمەیە.. ئەوی سەر بە عەشیرەتی ((دەمەنان)) بوو، بۆ دێی ((بۆر)) کۆچیان کردووە، بۆیە بەو ناوەوە ناسرابووین.. کە ئەو پرسیارە دەکات ((ئەشلێ)) هەڵسا تاکو بڵێت ((ئێمە بۆروجلەرین..))، بەڵام مامە ((ئیڤس)) نەیهێشت، کە کەس متەق ناکات، دەڵێت: ((گوناهی خۆتان بە ملی خۆتان)) وا دەڵێت و دوور دەکەوێتەوە..

ی. ئەر: بۆ وای گوت؟

- نازانم.

دوای ئەمە ئێمەیان بردە دێی ((وانگ)) و لەسەر کانیەك ڕایانگرتین، بەڵام نەیاندەهێشت ئاو بخۆینەوە... ئەمجا بۆ دۆڵێکیان بردین، هەموومان دەستمان بەسترابووەوە..

ی. ئەر: موختارەکەتان چی بەسەرهات؟

- لە ڕێگا کوشتیان..

ی. ئەر: ناوی چی بوو؟

- ناوی ((کاوان)) بوو..

موختاری دێی ((خێچە)) ناوی محەمەدی خدێ بوو، ئێمە کاتێك لەوێ بووین لەولاوە چەند سەربازێك هێنایان.. گەیشتە تەنیشتمان وتی: ((بچنە پاڵ یەکترەوە)).. مەبەستی ئەوە بوو، ئەگەر تەقەیان لێکردین هەموومان ناکوژرێین.. کە وای گوت ئێمەش چووینە بن دەستی یەکترەوە.

من چوومە پاڵ ڕانی دیکمەوە، یەکێك لە ژنەکان منی گرتبوو.. ڕوومەتیم نەدەبینی..

ی. ئەر: موختارەکەی ((خێچە)) چی بەسەرهات..؟

- ئەویشیان کوشت..

ی. ئەر: دواجار؟

- لەپڕ دەسترێژیان لێم کردین.. بەسەریەکدا کەوتین، گوللە سکی ژنێکی هەڵتلێشاند ریخۆڵەکانی کەوتنە لای من، من منداڵ بووم، زۆر ترسام، نەمدەزانی بۆ وامان لێدەکەن، تێنەدەگەیشتم، چاوم گێڕا، دایکم ببینم، بەسەر مندا کەوتبوو، من لە ژێرەوەی بووم.. منداڵێك دەگریا قاچێکی کەوتبووە ژێر لاشەکەی دایکمەوە.

ی. ئەر: منداڵی کێ بوو؟

- باوکی ناوی مەمەدێ ئیبراهیم بوو...

ئەمجا سەربازەکان هاتنە سەرمان، ئەوەی زیندوو بوایە بە سونگی دەیانکوشت، من دوو منداڵم بینی بە سونگی کوشتنیان..

ی. ئەر: ناویان چی بوو؟

- ناویان نازانم، بەڵام یەکێکیان باوکی ناوی ((تیتو)) بوو-تیتیێ زێنیێ- کە سەربازەکان دوورکەوتنەوە، کچە مامێکم ((ئەلا حەمیێ))ی ناوبوو.. وتی: ((هەستن سەربازەکان رۆیشتن..)).. ئەوەی نەمردبوو، یان زامەکەی سەخت نەبوو، هێواش هێواش هەستان، کە ئەوانم بینی، منیش خۆم لەژێر دایکم دەرکرد، تومەز دایکیشم نەمردووە، وتی ((وای ماویت؟)) خوشکەکەشم خەڵتانی خوێن بوو، تومەز خوێنی خۆی نییە و بەرنەکەوتووە.. لەوەدەمەی تەقەیان لێمان کرد، فەجیرە و محۆ رایانکردبوو، فەجیرە خێزانی لیلیێ حوسیێ بوو، لەوکاتەدا دووگیان بوو.. ((محۆ)) زامدار بوو کەمێك دەڕواو و پەکی دەکەوێت، لەپاڵ بەردێکدا خۆی مات دەکات، بەڵام کە سەربازەکان بەوێدا تێدەپەڕن دەیبینن، بەو زامداریەوە دەیکوژن.. بەڵام ((فەجیرە)) دەچێتە ناو کۆمەڵێك دار پەلکەوە نایبینن... ئەوانەی رزگارمان بوو بوو، چووینە ((وانکی))، لەویێ فەجیرەمان بینی.. دەمەو ئێوارە، دوو سەرباز پەیدا بوون، سەربازەکان کورد بوون، ترساین. بمانکوژن.. دایکم زامداربوو، بەڵام زامەکەی سەخت نەبوو.. دایکم سنگی خۆی خستە دەرو رووی لیان کرد وتی ((ئەز مایا سما، سما لازیێ مە)).

- من دایکی ئێوەو ئێوەش کوڕی منن-وای گوت تا نەمانکوژن {ئەو شێوە ئاخافتنە لە دەوروبەری دەرسیم کرداسکی پیێ دەڵێن..} .. ئیتر دوو سەربازەکە دوور کەوتنەوە.. کە دەڕۆن دەڵێن: ((لێرە مەمێنن، خۆتان وەشێرن، سەربازەکان بێن دەتانکوژن...)). لەولای ئێمەوە دەنگی ئای ئۆف هاتە بەرگوێمان.. تومەز ((شیرا حەسە))یە، زامەکەی کارییە و ناتوانێت ڕیێ بکات، هەر مایەوە و لەوێدا مرد.. ژنەکەی مامەم حوسێن وتی: لە دێی ((ئاسکە سوورە)) مامم لەوێیە با بۆ ئەویێ بچین، کەوتینە ڕیێ لە ڕێگا کۆمەڵێك لاشەمان بینی کوژرابوون، پیاوانی دێکەی ئێمە و دێی ((خێچە))یان لەوێدا هەموو کوشتبوو.. بەرەو سەرەوە گەڕاینەوە.. شەویێ درەنگ گەیشتینە ((ئاسکە سوورە)).. ترساین، لە دێکەدا سەرباز هەبێت، لامان نەدا، لەسەر رێگاکەماندا ئەشکەوت هەبوو، خۆمان خزانە ناو ئەشکەوتەکەوە.. ئەو ڕۆژە سەربازێکی یەکجار زۆر هاتنە ((ئاسکە سوورە)) لەپڕ کابرایەکی کەڵەگەت هاتە ناو ئەشکەوتەکەوە، ئامۆژنم هەستاو باوەشیان بە یەکدا کرد و گریان.. دواجار پیاوەکە وتی: لێرە تا تاریك دادێت بمێننەوە، ئەوجا بۆ ئاوایی وەرن.. ئێمەش وامان کرد.. چووینە ماڵی

((نەسۆ)).. دێکە چۆڵ بوو، خەڵکەکەی هەڵاتبوون.. خواردنیش دەست نەدەکەوت، هەرچۆنێك بوو هەندێك نانی جۆی بۆ هێناین، شەو دووبارە کەوتینە ڕێ، دیسانەوە بۆ ئەشکەوتەکە.. ئەو شەوەو بەیانییەکەشی لەوێ ماینەوە، کە شەو داهات زۆزانەکانی لای خۆمان کەوتینە ڕێ بەرەو ، کە گەیشتینە ئەوێ لە هەموو شتێك نائومێدبوو بوین هەمووومان دەستمان بە گریان کرد. دواجار چووینە سەر کانییەك.. بێ گومان سەربازەکان هیچیان بۆ نەهێشتبووینەوە. پەز و مەڕ و ماڵاتمان تالآن کرابوو.. کە هاوین هات و میوە پێگەیشت بووژاینەوە.. هەواڵ بڵاوبووەوە ((حکوومەت ئازووقە دابەش دەکات..)) ئەوانە ئێمەش ڕۆیشتن، بەڵام ئەوەی دەیاندایێ بە کەڵکی خواردن نەدەهات.. چەند ساڵێکم بەو ڕەزاڵەتە ژیانمان گوزەراند، تا بەرە بەرە خۆمان گرتەوە.. بەڵام لەم ساڵانەی دواییەدا دیسانەوە تۆفانێکی تر هات.. دێکانمان سووتێنران و لە زێدی باو و باپیرانمانیان دوورخستەوە..

ی. ئەر: دوای کۆمەڵکوژییەکەی ٣٨، گەڕانەوە دێکەی خۆتان وا نییە؟

- دێکانمان لێ قەدەغە کرابوو.. ئێمەیان بردە ((زەمێقە))، ئەو خانووانەی بە پێوە مابوون چووینە ناویان و تێیاندا ژیاین.. نزیکەی دە ساڵێك لەوێدا ماینەوە، دواجار گەڕاینەوە، دوای ئەوەی لێبوردن دەرچوو...

ی. ئەر: لە قەتلوعامەکە، چەند کەستان لێ کوژرا؟

- هەر لە خێزانەکەی ئێمە ١٧ کەس کوژران...

ی. ئەر: سوپاستان دەکەم بۆ ئەم زانیاریانە...

- من سوپاسی ئێوە دەکەم...

**مونزور چەم (حوسێن بایسولون) Munzur Cam**

* لە ساڵی ١٩٤٥ز لە بنگویل لە دایك بووە، قۆناغی ناوەندی لە دەرسیم تەواو کردووە، ساڵی ١٩٦٦ز، لە دیاربەکر خوێندنی تەواو کردووە، دواجار چووەتە کۆلێژی زانیاری بازرگانی، ساڵی ١٩٧١ لە ئەنقەرە خوێندووە.

* لە ساڵی ١٩٧٠وە لە گۆڤاری Özgürluk و ڕۆژنامەی Roja Welat نووسینی بڵاوکردووەتەوە، لە ساڵی ١٩٨٠ز لە دەرەوەی تورکیا دەژی. ئەم بەرهەمانەی چاپ کردووە:

* پیێ بکەنە دەرسیم، ڕۆمان، لە سێ بەرگدا بە تورکی نووسیویەتی.

* هوتای سەررا یوسفیێ، بە زاراوەی زازایی.

* گاییێ کەلامیێ دەرسیمی، بە زاراوەی زازایی.

* فەرهەنگی تورکی — زازایی.

* کێشەی عەلەوییەکان و ڕاپەڕینەکەی دەرسیم، بە تورکی.

* زمانی دارستان، کورتە چیرۆك.

* بانگەوازی یاخی بوون، ڕۆمان، بە تورکی.

* نانەکەشیان سووتاند، ڕۆمان، بە تورکی.

**ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل:** بەرهەمە چاپکراوەکانی:

* ١- دارەکەی بەر ماڵمان. ٢- ئەسپ. ٣- چاوەڕوانی. ٤- بەردی سەبر. ٥- فڕینەکان. ٦- دەستی ئۆخەی {کۆمەڵە چیرۆك}.

* بەهاری ڕەش، ڕۆمان.

* باڵندەکان کۆچیان کرد، مارەکەتان بکوشتایە، دەریا تۆرا، گەمییەکەی نووح {لە نووسینی یەشار کەمال} لە تورکییەوە کردوونی بە کوردی.

* باڵندەکانی ئێوارە، کۆمەڵە چیرۆك، لە ئەدەبی تورکییەوە.

* دۆخ گۆڕینەکانی عایشە، یادەوەری عەبدولوەهاب بەیاتی، لە عەرەبییەوە.

* وێنەیەکی دەگمەنی کافکا، کۆمەڵە چیرۆك، لە عەرەبیەوە کردوویەتی بە کوردی.

* چیای خودا، ڕۆمانی (ئاری دی لوکا).

* یاخی بوونی ئافرەتان/ نازم حیکمەت، لە تورکییەوە.